# پیانۆی ڕۆژهەڵات و ئەوانی دی





دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی



زنجیرەی ڕۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناوونیشان:

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، گەڕەکی خانزاد، هەولێر

شیعر

# پیانۆی ڕۆژهەڵات و ئەوانی دی

کەریم دەشتی



کتێب: پیانۆی ڕۆژهەڵات و ئەوانی دی- شیعر
دیوانی: کەریم دەشتی
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٣٣٠
دەرهێنانی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
دەرهێنانی هونەری: ئاراس ئەکرەم + دلاوەر صادق
پیت لێدان: نسار عەبدوڵڵا + تریسکە ئەحمەد
هەڵەگری: هندرێن شێرزاد
هەڵەگریی سەر کۆمپیوتەر: عەزیز عەبدولخالق
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٤
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٣٣٩)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ

## سرووتەکانی نووسین

نووسین بۆ من ڕەزمی مانەوەیە، ڕەزمی ناوەوەی ژیانە، بۆیەش هەمیشە لە هەر شوێنێک بم بیر لە نووسین دەکەمەوە، چونکە دەزانم بێ نووسین ڕۆدەچم و دەتوێمەوە، بێ نووسین هەست بەهیچ ئاسەوارێکی خۆم ناکەم، تەنانەت ئەو کاتانەی کە نانووسم خۆم هەست بەبوونی تەواوی خۆم ناکەم. ڕەنگە هەبن ئەوە بەحەقیقەتێک نەزانن، بەڵام ئەوان خۆیان وان و هێشتاکە شارەزای ئەم لۆگۆسە نەبووینە... کاری نووسین پەڕینەوەیە بۆ جیهانێک جگە لە خودی نووسەری ڕاستەقینە کەسی دیکەی تێدا نییە. جیهانێک زێتر لە شەوق و سیحر دەچێ، لە فەریکی ئەو گوڵە گەنمە دەچێ کە شیری ژیانی تێدا دەجمێ و دەکەوێتە سەماوە، بۆیە نووسین لە دید و بۆچوونی من ئەنجامدانی فەرزەکانی ئایینێکە لە هی ئایینێکی دیکە ناچێ، موریدەکانیشی لە موریدەکانیان ناچێ، کە ئەمە درامای نووسین بێ، دەبێ نووسەر بەچ دەستنوێژێکەوە بچێتە نێو ئەو پەرستگە پیرۆزەوە، چۆن لە بەردەم ئاگری نێویەوە بنووشتێتەوە، ئەمەیان نهێنییەکە و تەنیا ئەو کەسانە پەی پێ دەبەن کە لە ناوەوەی پەرستگەکانی خۆیان سرووتی داهێنان بەڕێوەدەبەن.

کاتێک قەڵەم دەگرمە دەست و دەچمەوە ئاوایی شیعر، تەکانێکی بەهێز دەدەمە خۆم و خوێنێکی هێجگار زۆری جەستەم دەخەمە خرۆش بۆ ئەوەی بتوانم بەرگەی ئەو هەموو پۆلیە ئاگرانە بگرم کە لە نادیارەوە دەبارێتە سەر ڕۆحم، زۆر جار لە خۆم دەپرسم، بەنێو پەراوێزی کتێبەکانەوە دەگەڕێم، دەچمە قووڵایی هەموو کێشەکان، هەر بۆ ئەوەی بزانم ئاخۆ ئەم هەموو ئاگرە لە کوێوە دێ و هێندە بەلەززەت هەڵدەپڕژێنە سەر ئەتڵەسی نووسەرەوە، بەڵام هەموو هەوڵەکان بێهوودەن، مەحاڵە دەرک بەو سەرچاوانە بکەین کە ئاگری نووسین بەرپا دەکەن، چونکە دڵنیام بەدۆزینەوەی ئەو سەرچاوانە هەرچی بەها و ئیستاتیکای نووسین هەن وردوخاش دەبن و هیچ سوودێک بۆ نووسین نامێنێتەوە، ئەلێرەوە پرۆسێسی نووسین بۆ من چۆنیەتی پێشوازی کردنە لەو ئاگرانە، یاخود پرۆسێسی دووبارە خەڵق کردنەوەی پرومیتۆس و کاری ئاگر دزینە لە خواوەندەکان، کە ئەمەشیان قوربانیدان و چوونە ژێر باری قەدەرە.





ئەو کاتەی قەڵەمم گرتە دەست و خۆم ئامادە کرد، ئەوا هێشتا نەچوومەتە نێو ئەو میحرابە موقەددەسەی کە نووسەر تێیدا هەموو جوانییەکانی خۆی لە دەست دەدا لە پێناوی ئەو جوانییانەی کە لەنێو دەرگا و پەنجەرە و کەوانەی ئەو میحرابەدا خۆیان حەشارداوە و هاواری قەڵەمی نووسەر دەکەن کە ڕزگاریان کەن لەو نادیاری و نهێنیانەوە، هەر بۆیەش لەگەڵ یەکەم ساتی تێکەڵ بوونم بەو زەمەنە نادیار و ئەو جوانییە نادیارانە و ئەو فەزایە بخورییە، هەموو وجودی خۆم ون دەکەم و بەناچاری دەبێ خۆم لە نووسینی شیعر خەڵق کەمەوە، کەواتە نووسین هەمدیس بۆ من ئەنجامدانی سرووتەکانی قەقنەسە لە سووتان و دووبارە زیندووبوونەوەی لە خۆڵەمێشەکەی خۆیدا، کتومت نووسینی شیعر سرووتێکی ئەفسانەیی سیحرئامێزە، ئەلێرە کێشە سەختەکەی شیعر دێتە ئاراوە، ئیدی ئەو لافاوە دەستپێدەکا و هەڵدەچێ کە ئامان و بوار بەهەموو نووسەرێ نادات، نووسەر دەکەوێتە ژێر سرووتی شمشێرەکەی دیموکلیس هاکا بەجوانییەکان کۆتایی پێ دێت.

ئەلێرەوە لە هەمان ئەو فەزایە تراژیدی و لەززەتبارەوە من قەڵەم بەکاغەزدا دەهێنم و بێ باکانە، یەکە یەکەی دەمارەکان و تەڵە تەڵە ئیحساساتەکانی خۆم پێشکەش بەجەللادەکانی جوانی دەکەم، ئەو جەللادە شەرمنانەی کە بەئاستەم دیارن و دیار نین، بەم جۆرە شیعر نووسین لە لای من لە دەستدانی بەئەنقەستی هەموو ڕۆح و بۆن و بەرامەی خودە، ئەو خودەی کە بەم کارەوە خاڵی دەبێت لە هەموو ئەو شتانەی کە بەر لە هاتنە نێو ئەو مەعبەدە پڕی بوو لە جووڵە و خرۆش، پڕی بوو لەو هۆکارانەی ژیانیان بەهیواوە لە ئامێز گرتبوو، ئەو مەعبەدەی لە دوورەوە فیردەوسێکی هێجگار غەریب و جێ مەبەست بوو، یاخود یۆتۆپیایەک بوو بۆ «من»ی شیعر، بەڵام کە دەچیتە ناویەوە بەڕاستی گۆڕستانێکی گەورەی جەستەی «من»ی شاعیرە، بەم جۆرە بەدرێژایی ساڵانی نووسینی شیعر هەمیشە چوونم بۆ نووسین، چوون بووە بۆ نێو ئەو یۆتۆپیایە و هاتنەوەشم هەمیشە گەڕانەوە بووە لەو گۆڕستانە، لە میانی یۆتۆپیا و گۆڕستاندا من ئەزموونی نووسینی شیعری خۆم پەرەپێداوە و هەمیشە سیزیف لە ناخمدا دەستی بەڕەگی بەردەوامیم گرتووە.

ستوونەکانی ئەو مەعبەدە و هەڵوەرین بەنێو هەیوانەکانی؟ مەعبەدی شیعر نووسینی من، لە هی هیچ کەسێ ناچێ، تەنانەت دەتوانم ئەوە بڵێم و دەشتوانن لە شیعرەکانمدا ئەوە بدۆزنەوە کە من شاعیرێکم خودانی مەعبەدێکی وام نموونەی قبووڵ نییە، نە لە دەر و دیوارەکانی دەرەوەی، نە لە شێوە و سیمای کۆشک و تەلاری، نە لە تاق و پەنجەرەکانییەوە، مەعبەدی شیعر نووسینی من نە کەس دیویەتی و نە کەسیش دەیبینێ،

پێتان سەیر نەبێ کە من بۆ خۆم مەعبەدی وام هەڵبژاردووە، لە شووشەی شکاوی مرۆڤایەتی دروستم کردووە و بەکریستاڵی دارژاوی فرمێسکی مرۆڤایەتی ئاوم داوە و بەپارچە پارچەبوونی جەستەی خۆم ئاڵووالآم کردووە، بۆیە ئەوەی قبووڵیەتی خودی خۆی یا خودی شاعیر خۆی بکاتە قوربانی، دەتوانێ مەعبەدێک ئاوەها بۆ خۆی بونیات بنێ و لە نووسینی شیعردا تێیدا فەنا بێت و حەللاج ئاسا لە کاتی ڕشتنی خوێنیدا بۆ ئەوەی خەڵک پێی نەڵێن ترساوە و ڕەنگی زەرد بووە، بەدەستەکانی خۆی خوێنی جەستەی خۆی لە ڕوخساری هەڵسوبوە... ئاوەها دەبێ بەخوێنی خۆی ڕوخساری خۆی سوور بکات... ئەمە مەعبەدی نووسینی منە.

کاتێک لە پرۆسەی نووسینی شیعردا لەژێر ستوونەکانی ئەو مەعبەدە دەوەستم خۆم تاقە کەسێکم سەلیبی خۆم لە دەستە و بیر لە پاڵەوانەکانی مێژوو دەکەمەوە. «نیتشە» کە بەکوشتنی خواکان کۆتایی مێژووی ڕاگەیاند، مەسیح کە بەچوونە ژێر باری سەلیبەوە ترۆپکی هەموو قوربانییەکانی دارشت، کەواتە داهێنانیش بوارێکی دیکەیە بۆ دروستبوونی پاڵەوان، دەبێ ئەوەی شیعریش دەنووسێ سڵ لە چارەنووسێکی ئاوا نەکاتەوە، هەر بۆیەش جاروبار سەربەرز دەکەمەوە و لە بەرزی ئەو ستوونانە دەگەڕێم کە نایانبینم... ڕەنگە سەریان لە حەوت تەبەقەی ئاسماندا بێ، ڕەنگیشە سەریان هەر لە لای خودا بێ، کەواتە من لە ژێر سێبەرێکا مەعبەدم تەی کردووە کە لە هێز و قودرەتی مرۆڤ نەبێ بەباڵایدا هەڵگەڕێ... بەڵام دەبێ پێیدا هەڵگەڕێ... جا یا سەردەکەوێ یاخود دەبێ بکەوێتە بنیەوە، من لەژێر ئەو ستوونانەوە بەدوای ڕۆحی بەردەوامبوونی شیعرێک دەگەڕێم جاویدان بێت.

کاتێکیش دەچمە بەر ئەو پەنجەرانەی کە لە نێو ئەو مەعبەدەدایە، هەموو ڕووداوەکان دەبینم، تراژیدیاکانی ئەم سەرزەمینە، ئاگری سووتانی ڕۆما و پڕوشکی فڕنەکانی هیتلەر و کارەساتەکانی تزار و تەقینەوەی بۆمبی ئەتۆمی...

گەلێ... گەلێ لەو تراژیدیایانە دەبینم کە هەرگیز کۆتاییان نایەت، بۆیە هەندێ جار لە بەرابەر ئەوانەوە هەر لەبەر ئەم پەنجەرانەوە قەڵەمم وشک دەکات و ناتوانێ بگاتە ئاستێک لە داهێنان، باسکردن تێیدا گەورەتر بێ لە حەقیقەتی ئەو ڕووداوانە... هەندێ جاریش هەر لەبەر ئەو پەنجەرانەوە، فریشتەکانی جوانی و ئۆپێرا و سەماکان، فڕینی مەلە جوانەکان و مەلەی کچانی بەهەشت، دیالۆژی عاشقەکان دەبینم و ئیدی قەڵەم دەبێتە ئەو





ئاسمانەی کە لە باراندا ناکەوێ لەبەر ئەو پەنجەرانەوە هەندێ جار شیعرەکانم ئاوی جاویدانی مەلحەمیەت دەخۆنەوە و هەندێ جاریش زەربەی تۆماری خێرا لێ دەدەن، ژیانی نووسین لە بەرابەر ئەو پەنجەرانەوە بەڕاستی سەخت و نهێنی ئامێزە بۆ شاعیر.

لە نێو ئەو مەعبەدە پیرۆزەی مندا ژیانی نووسین بریتییە لە هەڵگرتنەوەی ئەو ڕۆحەی کە بەدوای وەدەستهێنانی جوانیدا وەک گەوهەری عومر، عومری هەڵڕژاوت، ژیانی نووسین بریتییە لە گەڕان بەدوای ئەو پارچە شکاوانەی لە جەستەی نووسەردا دەبێتەوە و لەو کاتانەی لەژێر ستوون و پەنجەرەکانیدا سەیری ئاوابوونی خۆر و هەڵوەرینی گەڵا و دروستکردنی هێلانە دەکات، بەم جۆرە هەموو شتێ لەو مەعبەدەدا قوربانیی دەوێ، هەموو جوانییەک بەشێک لە دارمانی جەستەی دەوێ و هەموو داهێنانێک هۆیەکە بۆ خاڵی بوون لەو ئەزموونانەی کە بۆ ساتێکی نووسین کۆیان دەکەیتەوە. ئەم مەعبەدەی من ڕێگە بەهەموو کەسێکی داهێنەر دەدات، بەڵام هەرگیز زامنی داهێنانیان بۆ ناکات.

من هەر لە هەوەڵەوە تەک تەک خشتم لە مەزارە دوورەکانی ڕۆحەوە بۆ ئەو مەعبەدە هێناوە، ئاوی جاویدانیم بۆ لە جۆگەلە نادیارەکانی بەهەشتەوە ڕاکێشاوە و قورقوشمی جوانیشم لە سەرچاوەکانی ئاگری دۆزەخەوە بۆ هێناوە، تەنانەت بەنووسینی چەندین و چەندین شیعر نەمتوانی سیمای دەرگایەکی بچووک بۆ ئەو مەعبەدە لەبەرچاوم بەرجەستە بکەم، بەڵکو عومرێکی درێژم بردە سەر تا لە چەند قەسیدەیەکا تروسکەی ئەو مەعبەدەم بۆ وەک نوورێکی خودایی بەدیار کەوت، شەوانە لەبەر ڕۆناهی ئەو تروسکانەوە دەچوومەوە ئاگردانەکەی زەردەشت وردە وردە ئەو مەعبەدەم بۆ مشتوماڵ دەبوو... گەلێ سات و وەختان مەستانە دەچوومە بەر ئەو قاپییەی لەژێر تروسکایی ئەو مەعبەدەدا بەدیار دەکەوت، سەیری ناوەوەی ئەم دنیایەم دەکرد، هەر هەمووی سیحر و خورافات بوو، ئەفسانە بوو، گێرمە و کێشەی خواکان بوو، ونبوونی ئۆلیس و گومانی هاملێت بوو، دنیایەک بوو تا ئەو ساتەشی لەگەڵدا بێ، من لە سیحری ئەو مەعبەدە نەگەیشتووم، هەر ڕۆژە و نهێنییەکم بۆ ئاشکرا دەبێ و هەر ساتە لە بەرابەر چڵە نەرگزێکی شیعرەکانم ئاوی ژیان دەخۆنەوە.

ڕۆژە باراناوییەکانی نێو مەعبەد ئەو ساتانەن لە نووسینی شیعردا لەژێر کڵاوڕۆژنەی گومەزی ئەو مەعبەدە سەیری دەرەوەی ئەو مەعبەدە دەکەم، چونکە مەعبەدەکەی من کاستالیای هێرمان هیسە و ژوورە گۆشەگیرکراوەکەی پرۆستە، تەنانەت هەندێ جار گوێم

له قوتابییه‌کانی مه‌عبه‌د ده‌بێ که‌ چۆن چۆنی دوعا بۆ ئه‌و سه‌فه‌ره‌م ده‌که‌ن، سه‌فه‌رێک که‌ له‌ میعراجی دانتی ده‌چێ، ده‌ره‌وه‌ی ئه‌و مه‌عبه‌ده‌ بۆ من جه‌نجاڵێکه‌ له‌ شیعر، هه‌ن ده‌نگیان زۆر به‌رزه‌ و به‌قایم قسه‌ ده‌که‌ن، به‌ڵام هه‌رگیز لێیان حاڵی نابن، لێره‌ بۆنی ئه‌و شیعرانه‌ی ده‌ره‌وه‌ له‌ ویزه‌ی کۆمه‌ڵه‌ هه‌نگێک ده‌چێ به‌ناویه‌کا ده‌سوورێنه‌وه‌، هه‌ندێکی دیکه‌ ده‌بیستم که‌ نایانه‌وێ بچنه‌ نێو ئه‌و گه‌ڕه‌لاوژه‌یه‌ و نه‌رم نه‌رم که‌وتوونه‌ته‌ سه‌ر جه‌سته‌ی شیعره‌کانی خۆیان و به‌هێمنی گه‌وهه‌ره‌کانی شیعر به‌سه‌ریه‌که‌وه‌ داده‌ڕێژن، ئه‌وانه‌ بانگ ده‌که‌مه‌ مه‌عبه‌ده‌که‌ی خۆم و زۆران جار به‌یه‌که‌وه‌ له‌ نووسینی شیعر و وه‌ده‌ستهێنانی داهێنان سه‌فه‌ر ده‌که‌ین.

«نالی و مه‌حوی» فه‌رجیلی (دانتی)ین بۆ من هه‌میشه‌ و بێ وچان ڕابه‌رایه‌تیم ده‌که‌ن له‌و میعراجه‌ سه‌خته‌ی نێو مه‌عبه‌ده‌که‌ی خۆم وه‌ک دوو ئیمامی گه‌وره‌ و نوورانی نهێنییه‌کانی نێو مه‌عبه‌ده‌م بۆ به‌رمه‌لا ده‌که‌ن، ئه‌مه‌ چه‌ند نهێنییه‌کی زۆر بچووکی چۆنیه‌تی نووسینی منه‌ له‌ شیعر و ته‌نیا چه‌ند ساتێکی ئاشکرای نێو ئه‌و مه‌عبه‌ده‌ پیرۆزه‌یه‌.

## شەوان شیعر هێلانەیە

(١)

بێ تۆ نەخشەی ئەم جیهانە
بێ ڕەنگە و هەم بێ دەریایە
بێ تۆ هەموو وەرزی سالآن
پاییزێکی کشوماتە بێ هەرایە
بێ تۆ ئازیز ژیان ڕەشە و ساڵ نەهاتە
بێ تۆ ژیان دورگەیەکی پڕ لە خەم و کارەساتە!

(٢)

هەموو شەوێ دەرگای چاوم لە ئەستێرەی فرمێسکەکان ئەکەمەوە
هەموو شەوێ بەقەد ئاوی ڕووبارەکان
دڵی ڕەنجاوم بەپشکۆی شیعری غەریبێک ئەدەمەوە
شیعر گوڵە، شیعر ئاوە... شیعر خوێنە
شیعر هێلانەی تەمەنی، ڕێبوارێکی سەرهەڵگری دوای شوێنە

(٣)

شەو درێژە من و خێڵی ڕووبارەکان، ئیتر ئەو ناوە جێ دێڵێن
لەگەڵ نیگای مانگی چاوی شەپۆلەکان
یا ژیان کۆتایی دێت و یا چەپکێ خونچەی خۆر دێنین!

(٤)

پەرۆی لاتی پەنجەرەکەتم لێ لادە
لە درەختی چاوانی تۆ
ڕەنگ پەڕیوم هێلانەیەکی خۆم ئەوێ
گشت ئێواران چەند دووربم بۆ لات بێمەوە
شەوان لە باوەشی پووشی خەمبەری تۆ
بۆ دوا هەواری چاوانت کۆچ بکەم و قەت نێمەوە!

١٩٧٥/١١/٥





## لە لاپەڕەی عیشق و خەما

(١)

چارەنووس:
وتیان برین چەند هەنگاوی تەمەن بنێتە ناو چاوی
ڕەشی مەرگ
بەڵام هەر عاشقی نیگای داو و دەرمان و تکە و تیمارە
وتیان هەور چەند سیمای (گرانی) بنوێنێ
بەڵام گیانە
زەویی تێنوو هەر عاشقی دڵۆپە ئاوی بارانە!

(٢)

عاشق ئەڵێ ڕێگە بۆ دورگەی لێوی ئەو
بەقەد تەمەن دووردرێژ بێ هەر ئەیبڕم
هەتاوی چاو چەند بڵند بێ
ئەبێ بیکەم بەهەوارگە و ئێشکی غەریبی لێ بگرم
عاشق هەر چەند لەناو کڵپەی عەشقی خۆیا
بمرێت و هەم بتوێتەوە
سەد ئەوەندە و هەزاربارە تێ هەڵئەچێ و ئەتوێتەوە

(٣)

نەسرەوتن
گیانە شیرین هەموو شەوێ
کە ئەستێرە چاوبازەکان
لە باوەشی ئاسمانێکی پانوبەرین ڕائەکشێن
گەڵای دار و درەختەکان
لە جیهانێکی بێ دەنگی بەسەریەکا دائەخشێن
با ئەنوێت و ڕووبار لە شەپۆڵ کپ ئەبێ و دائەکەوێ

بەڵام گیانە نازەنینم دڵی هەڵچووم وەکو ئەوان
بێ مەرگی ناو باوەشی تۆ
قەت چاو لێک نانێ و ناخەوێ
پەپولەیە و بەسەر هەستی لێکدانەوەما ئەسوڕێ و
قەت ناسرەوێ

(٤)

خەم
ئەی ئەو خەمەی لەگەڵ بووما
ڕەگت لەناو دڵ و گیانی من ڕواوە و داچەنیوە
تۆ خوێنیت لە شادەماری من ئەجمێی
تۆ گوڵیت لەناو دڵی مندا ئەڕوێی
لە هەر کاتێ خەم لێم دووربێ من ئەو کاتە زامار ئەبم
لە هەر کاتێ خەم لێم ون بێ من ئەو کاتە خەمبار ئەبم
خەم بەهارە و خەم هەتاوە
خەمە و لەناو دڵی منا
سەدان هەزار دەستگیرانە و لێشم ونە
خەمە و لەناو کێڵگەی بیر و تاسەی تێنووم
ڕووبارێکی بەبێ بنە

١٩٧٥/٧/١
هەولێر



## پشوودان

«ئەلێرەوە ئەستێرەیەک، ئەلەوێوە ئەستێرەیەک هێندێکیان ڕێگە ون ئەکەن،
لێرە پەڵە هەورێ، ئەلەوێوە پەڵە هەورێ لە دوای ئەوانیشەوە، خۆر»
«دیکنسون»

ئاگادار بەکۆترەکانی ئەم هەوارە
نوستوون بێداریان مەکەوە
هەر کۆترێ کۆچەری ڕێیەکی سەختە
هەر ڕێگایێ بۆ کێڵگەیەکی پڕ چەقۆی بەفربەختە
نوستوون بێداریان مەکەوە
ئەم کۆترانە خەمی منن، خەمی چاوی یارەکەمن
ئەم کۆترانە خەمی ئێوە و شارەکەمن
لێیان گەڕێ... تا بە ڕەوە سەر هەڵئەگرین
بۆ چاوی تیشکێ لە خۆری پێکەنینمان
سەدان دەریاچەی خەم ئەبڕین
یا ئەم خەمە لە گۆڕ ئەنێین
یاخود هەتا مردن ئەفڕین!

١٩٧٦

## بەرزی

من لە ناخی چاوەکانتا ڕەشماڵی گیانم هەڵداوە
هێشتا غەریبی چاووتم
من ڕەگوڕیشەی برینم تێکەڵ بەخاکی تۆ بووە
هێشتا من شەیدای گەیشتن بەناونیشان و ناووتم
قەد و باڵای شاخەکانت
بەهێزترن لەوەی حیلەی ناسازی ڕەشەبا بیهەژێنێ
ڕووی ڕووبەری پەلکە مێوە سەوزەکانت
گەورەترن لەوەی کەوا
پاییزی کاڵی ئەم سەدە تفت و تاڵە بیوەرێنێ!

١٩٧٦



## سۆراخ

بمناسەوە، بەدڵ، بەگیان، بەڕەنگ و بۆ
ئەم ئەستێرانە ئەبینی؟
ماچی من و گەردنی تۆن
ئەم ڕووبارانە ئەبینی؟
هەناسەی گۆرانی من و شەپۆڵەکانیشی دڵی
هەڵپەڕکێی تۆن
ئەم چۆلەکانە ئەبینی؟
هەموو نامەی پەنجەی منن بەدوای نیگات هەڵفڕاون
ئەم هەموو کانیە وشکانەی بنار چیا بەدی ئەکەی؟
هەمووی ئاهی سەردی منن
لە پاش کۆچی کۆتایی تۆ سەربڕاون

١٩٧٦

## وەرزێکی گران

ئای ئەم گۆڕە بەرد و دارە
چەند هێمن و چۆڵ و هۆڵە
ئای چەند کۆرپەی سەربڕاوی وا بەکۆڵە!
سەیر کەن چۆن
گەڵا چاوی برینی ڕەز ئەکاتەوە
سەیر کەن چۆن لێواری داس
دڵی گوڵە گەنمەکانی ئەم هەوارە ئەداتەوە
ئای چەند چۆڵە!
کێیە بتوانێ غەریبی ئەم هەوارە
وەرزێ بۆ دوا بباتەوە

١٩٧٦



## دڵێکی سووتاو

جاران گیانە...
کە من هۆنراوەم ئەنووسی و چاوانی تۆش ئەیخوێندەوە
جاران گیانە
کە من شمشاڵی کۆچێکی شەو بەکێوانم لێ ئەدا و
تۆش گوێی ئارامت ڕائەگرت
دووری ڕێگام لە یاد ئەکرد
خەمی هەموو ئەم جیهانەم لە باوەشی تۆدا ئەمرد
ئێستاش خێڵی چاوانی تۆ لەناو لەپی مێرگی دەستم
کۆچیان کرد و جێیان هێشتم!
من ئێستا کە هەر دەفتەری تەنهایی خۆم ئەخوێنمەوە
ئای چەند تەنیا و خەم هەڵگرم
ئاخر لەگەڵ کاروانی کۆچی تۆ نەبێ
گیانە بۆ کوێ سەر هەڵگرم؟!

١٩٧٦

## خەرابات

تۆ تریفە گوڵ و مانگی من بووی ئازیز
هۆنراوەم لەبەرتا ئەلاواوە و چاوی وشەکانی ئەڕشت
تۆ چەمی خوڕە و ئارام بووی
من بەرکۆڵەی خەمەکانم تیا لێک ئەنا و
شەوانی ڕەشم تیا ئەکوشت
کوا ئەو ڕێگە و... ئەم ڕێبوارە؟
کوانێ ئەم چین و ماچینە
هەمووی ئێستا گوندێکی گیان هەڵقڕچاوە
درەختێکی خاپوور و دڵ پڕ برینە

١٩٧٦



## پەرژینە ئاخ

ئێ بەم شەوە تۆ چیت ئەوێ؟
نە من مەرگ و نە تۆ ژینی
ئەوەی هەمانە و نیمانە
من سەر تەڵی خەمەکان و تۆش لەشێکی پڕ برینی!
ئەوەی هەمانە و نیمانە
دوو چاوی عەشقی هەتاوە
دڵیش هەروەکو گوڵی (وان) پڕ گریانە
کەچی هەموو دەوروبەرمان
تاسە باران و زریانە!

١٩٧٧

## پەڕیوە

شەوان کاتێ لەگەڵ کزەی هەناسەما ئێشک ئەگرم
هەموو پەنجەرەی ژوورەکەم ئەکەمەوە
– لەو کاتەدا من ئەمبینی
وەکو بەفری لوتکەیەکی خۆر هەڵمژیو ئەتوایەوە
وەکو پشکۆی ئاگردانی هەژارەکان
هێندێ جار گەش هەڵئەگەڕا
هێندێ جاریش ئەکوژایەوە!
من ئەمبینی وەک ماندووێکی خۆر نەدیو
هەموو لەشی پڕ برین بوو
لە ڕێگەی هیچ سەفەرێکا
دەرگەی لە ڕوو نەکرایەوە!

١٩٧٧



## شاعیر

کێ هەیە وەکو شاعیرێ
بەدوای تەمەنی داڕژاو
شەوان چرای وشەی نامۆ داگیرسێنێ
ئەی کێ هەیە لەم جیهانە
وەکو شاعیر هەڵکڕوزێ
تا بزانی «بیرکردنەوە چەند گرانە» ؟

١٩٧٧

## لەگەڵ خۆمدا

– بەخۆمم وت:
ئەی شێتی وێڵ بەسیە ئیتر
هەوری تۆرای هۆنراوەی سوور لە گەردنت مەئاڵێنە
ئەوەی نووسیت بارانی سەر پاوانێک بوو
بۆ پاساری ڕەوسەی دڵت
درەختیلەی خەمی هێنا!
بەسە ئیتر خۆت مەخەرە ژێر ئازاری هەموو داوێ
وتی ئاخر
– چەند بیر لەو دارستانەی شاخ ئەکەمەوە
ئەگەر بێ و واز لە ڕەوشەنی ڕەگ بهێنێ
وەکو ئەستێرە دائەرژێ و
تۆی مردنی خۆی ئەچێنێ!

١٩٧٧



## هەوارگە

دارێ لە ڕەگی خۆی تۆرا
بۆ ناو کێوەکانی ئەودیو سنوورەوە سەری هەڵگرت
دەزووی غوربەتی گشت وڵاتێکی سەر ئەم زەمینەی
ئاڵاندە دڵی و
گلۆرەی چەمی زگماکی ناخی خۆی هەڵکردەوە
هێڵی خەمی هەموو دار و دەوەنی خوای
بەسەر پەرچەمی ئاوارە و نامۆی خۆی هەڵدایەوە
دوێنێش کە بینیم لەژێر بێزاری و ڕەشەبای زریان
بۆ خاکی دایکی بەچۆکی ئەدا و
ئەکرۆزایەوە لەژێر شاباڵی بێ سروەی گریان!

١٩٧٧

## شوێنەوار

بۆ وا کپە، وا شێواوە ئەم ڕێوبانە ؟!
بۆ وا لە خەم داگیراوە، ئاوا ماندوو، سەرگەردانە
دوای تۆ هەموو شوێنێک ئاوا کۆڵەوارە
دوای تۆ چاوی مانگی زەرد و ئەستێرەکان
بێ خەرمانە و ڕێگاکانیش بێ ڕێبوارە!
کێیە دوای تۆ چرای ئارامی هەڵبکات
کێیە لە پاش ئاوابوونی خۆری بازووت
ببێت بەگۆنای دیوارێک نێڵێ ڕەشەبا هەڵبکات
ونبوونی تۆ، چەند پڕ خەم و چەند دژوارە
ئای چەند کپە لە دوای چاوت
ئەم ڕێوبانە، ئەم هەوارە!!

١٩٧٦



## چڵەپۆپە

جریوەت بێ
تەشی دەمت خۆری لەشی ماندووبوونم ئەکا بەداو
هەگبەی ئەو گوندە دوورەی من
پڕ لە نامەی سەوز ئەکات
قژی کیژۆڵەی کەناران ئەکاتەوە
بۆ تۆقەی نەرمی خۆرەتاو
دڵت بکە بەنێچیری خرپەی گەرم
هەتا گەروت گوڵە عەشقی کێوەکانی لەسەر شین بێ
دەنگت مایەی گریانی شەوانی وشەم ئەهۆنتەوە
بەهەوێردەی سرکی لیسەی سینەت بلێ
دڵی کەشتیم لە ڕووباری کۆچی تەمەن ئەترازێنم
گلێنەی چاوم چەک ئەکەم
چی تر ڕاوکەری تەماشای
ئاوێنەی حەزی ڕابردووی خۆی بدوێنێ
ئەگەر شەوان لە هۆنراوەم بپەڕێتەوە
کاتێک ڕەوە بازنەکۆتی گەردنت لەنگەر لە مەچەکم بگرن
ئیتر منیش چیرۆکی درێژی شەوانم لە پرسەدا ئەتۆرێنم
شیرازەی نێو ئەشکەوتەبانی ئەو دڵە و
هەزاران خەمی بێ کەسیم ئەپچڕێنم
کەزیت ئەکەمە دیوەخان
شەوان هۆنراوەی تەنیایی ئەو کوێستانەی تیا ئەخوێنم
بەرلەوەی کۆت و پێوەندی مەرگی تەمەن
هەوک و لولاقم دابگرێ!
لافیتەی تازە خۆرێکی پێوە ئەکەم





که ئاسۆش سوور سوور هەڵگەڕا
لە گەردنی خۆم و دەنووکی هۆنراوەم دەئاڵێنم

***

نامەوێ پرچی بێ بەختت دوور لە پەنجەرەی شکاوم
ژەنگی غەریبی هەڵێنێ
تۆ نازانیت ئەی نازەنین شوشەس چاوت
ژانی چ هۆنراوەیەکی من ئەشکێنێ؟!
ئەشق ئەوەندە گەورەیە
ژان و مەرگ و باران و خۆر ئەگرێتە خۆ
تۆش چاوگەی هەموو عەشقێکی!

***

خوداش کاتێ کە تەنیایە لە هەراسانی و ماتەمی ئەتوێتەوە
خۆی لە خەنەی ماچی فریشتەیێ ئەگرێ و
گیان لە پەلی هەوەس ئەخات!
شەدە و هەوری ئاشقێکی هەژار ئەدزێ و لەسەر ئەکات
بەردە ئەستێی چاوەڕوانی لێک ئەخشێنێ
گڵپە چەرخی هۆنراوەیەکی شاعیرێ پێ ئەکات و
وردە ورد خۆی دائەگیرسێنێ
بەکلکە شاخی تەمەن و سەرگەردانی هەڵئەگەڕێ
ژانی دونیا ئەسووتێنێ!!

**١٩٧٧/٧/٢٥**



*«کێ خەونی بەوە ئەبینی کە جوانی وەکو خەون بڕەوێتەوە؟»*
یتیس

## چرپەیەک

بۆ -ن-
ئەی مانگی دوور بریا هەر ئەو کیژۆڵە بای
- نالی - شیعری بۆ ئەنووسی
- بێکەس - لە شەوانی خەم و ژانی زەوی
بۆ تاکە ژەمێکی مەستی
ئەیکردی بەهاوەدەمی خۆی
ئەی کچی دوور بریا تۆش ئەو کچۆڵە بای
منی بەفر وەکو لوتکە ئەمپەرستی
بریا هەردوو باڵی خۆم بڕیبا
نەوەک بەدوای سەرابی چاوت فڕیبا!

**١٩٧٨**

## ئەوانەی لە ناخەوەن

ئای ئەگەر بۆ تاکە جارێ کە بتوانم
چاوەڕوانیم وەکو دڵۆپێ خۆرەتاو داگیرسێنم
چەمی هەڵچووی ناو ئەو دڵە و تاسەی تەمەن بنووسمەوە!
ئای ئەگەر بۆ تاکە جارێ بم توانیبایە
خەمی سینەم وەکو چەپکێ فەریکی ئاسۆی ئێواران بگرتایە و
وردە وردە ڕاوی مامزی تەنهایی
ناو دورگەی لەشی شەکەتی خۆم کردبایە
ئەوسا ئەمزانی ڕوومەتی بیرەوەریم بۆ ئەسووتێ و
داری تەمەن چۆن پیر ئەبێ
بەڵام هەرچی چاوەڕوانی و خەم و عەشقە
وەک سێبەر و شنەبا وان
کەی دەستی کورتی شاعیرێ.
لە پرچی کێوی هەوراز و لوتکەی هەواریان گیر ئەبێ؟!

١٩٧٨



## ساتەکانی ئەوین

دوێنێ تەمەنی درێژی ساڵەکانم
خۆری ئاوابوونیان ئەکوشت
لە بێشەڵانی باوەشما وەکو چەپکێ داسی تێنوو
خوێنی چەتەی ماندووبوونی خۆیان ئەڕشت!
ساتەکان ئەبوونە سەدە و وەکو ڕەوە کۆتێکی لەنگ
لە دارستانی پێوەندما
حەسانەوەی ڕێگەی دووری خۆیان ئەمژت
ئەو دەمانەش بەدیار ڕوومەتی سووتاوی
گەرمە تیشکی هاوینانی ڕەنجبەریتا
تۆڕی هەموو بەندەرەکان ئەنێمەوە
ساڵم بۆ ناگێڕێتەوە!
کات وەکو بەفرێکی ماندوو بۆنی برینی تۆ ئەکا
بەناو چاوتا ڕائەبوورێ و ئەتوێتەوە.

١٩٧٨

## هەڵۆ

پێشکەشە بەچاوە خەمبارەکانی (ڕووبار)

وەک ئاگرێ
منداڵە بێ چەترەکان ژێر هەوری ئێوارە بەفرێ بیکەنەوە
چنگێ عەشق و خۆشەویستییت بۆ جێ هێشتین!
وەک زەنگەیێ غوربەتی شین
تاسە و برینی تەنهاییت بۆ جێ هێشتین
وەک ڕێبوارێ لە شارەدێی خەمەکانیا هەڵگەڕابێ و
(ورە) پۆڵە کۆترێ بێ و لە گلارەی چاوەکانیا هەڵیان بخا
وەک یاساوڵی شەوگارێ
دڕندە خەمی سنووری بۆ بباریێ
تا دوا دڵۆپەی تەمەنی هەڵۆی چاوی بەڕەڵلاکات
کەمەربەندی کێلە مێژووی خۆرەتاوت بۆ جێ هێشتین!

***

ئەگەر تاکە مەلێک بووایت
درەختەکان لە گۆنای گەڵا ئەتۆران، ئالای پاییزیان هەڵئەکرد
ئەگەر تەنها شەپۆلێک بووایت
ڕووبارەکان کاڵە پەڕۆ و سوخمەی ژانی هەڵنەچوونیان
لەبەر ئەکرد
بەڵام چی بکەم
خورە چەمێکی سەرپشتی تەمەنی ئەم کوێستانانەی
مینای چاوی لوتکەکانت بێ بینایی
گوڵی سووری کارێزەیان ئەدرێ لە یەخەی بەیانی

***

ڕۆژێ نووسیت ڕۆڵە هێمن کە گەورە بوویت
چرا لە شەوی هەژاران داگیرسێنە



پەنجەرەی دڵ لە ڕەشەبا نەکەیتەوە
تۆ باریت و مەلی هێمن هێلانەی دڵی غەریبم ئەکۆڵێتەوە
هەموو ڕۆژێ چاو لە کارگەی هاتنی من ئەکاتەوە
ڕووبارێ فرمێسکی غەریب
غەریب، غەریب وەکو غوربەتی درەختەکان هەڵئەڕێژێ

***

ئەگەر چی هێمن بچووکە
بەڵام خەمی گەورە گەورەی هەڵگرتووە
لە دووتۆی ڕوانینەکانی، کانی هەموو شاخەکانی
لە ناخا ئەتەقێتەوە
مەنوو ڕۆڵە، خەو کوختەی چاو کلیل ئەدات
لەنگەری بوون لە چاپێ مەرگ و ژان ئەدات
مەنوو ڕۆڵە...
چونکە نووستن دڕندەیە ئەگەر شەو خۆری بەدوا نێ
لوتکە تۆقەی ئەستێرەکان لە پرچی سپی خۆی نەدا

بەغدا – ١٩٧٨

*«لە دوور دوورەوە بۆ لات ئەفڕم*
*نەک بەپەیتونی -باخوس- و خاوەنەکانی*
*بەڵکو بەسەر باڵی هۆنراوەی*
*نەبینراودا*

*«جون کیتس»*





## شەوسوار

تەمەن وەکو ئاوی جۆگە و ڕووبارەکان ئەڕوات و ناگەڕێتەوە
وەرە هەتا چاومان تەرمی ڕوانینیان هەڵگرتووە
لەناو بۆتەی مانگە شەوانی سەرشێتا بتوێینەوە
ئاگادار نیت!
من چۆن چاوم وەک دوو هەڵۆی دڵ بریندار
بەشوێن دوورگەی لەشی تۆدا ئەخولێتەوە؟
ئەوەندەی تۆ دوور ئەبینی و هەوری ئارامی شەوانم ئەبارێنی
ئەوەندە تۆ لەناو مێرگی غەریبیما
چرای کۆچی خۆت پێ ئەکەیت، بێ دەنگی دائەگیرسێنی
ئەوەندە خەم لە دڵمایە
ئەوەندەی تۆ ڕووبارەکان ئەدوێنی و
وردە حەز و چرا شەوی نازەکانت
وەک نەرمە بای ئێوارانی بنارەکان ئەڕوا و لەگەڵ خۆیا ئەمبات
ئەوەندە من ئەسووتێم و
بسکی ڕەشت ئەمگرێت و لە سێدارەی شەوم ئەدات!
تۆ نازانیت چۆن ئەکوژرێم...؟
دوێنێ کاتێ ئاسۆ بوخچەی ئێوارانی ئەکردەوە
تۆش هەروەکو تەڵە کرۆسکێ
دڵمت لە دارستانی لەش بەردایەوە
وەکو ڕەوە چۆڵەکەیێ
ئاگری تاسە و فرینت بەردایە ڕەزی تەمەنم
وردە ئێشی شوێنەوارت لەناو دڵی مندا باراند!
دوا لاپەڕەی جێ هێشتننت هەڵدایەوە
ئەی تۆ ڕووبارت خۆش ناوێت



ئەی تۆ لەناو کێڵگەوەردی لەپی منا
چەندەها جار چاوەکانی خۆت ئەچاند و خۆشەویستیت ئەدوریەوە؟
گیانە لەناو ڕەوگەی ڕەشی پرچی تۆدا؛
من ئەستێرەی پەنجەکانم ون کردووە
منیش وەکو پاسارێ لە هێلانەی لێوی تۆدا
هەزار بەچکە ماچی تێنووم جێ هێشتووە!

***

ئەوێستاکە دووریت بۆتە چەند شەپۆلێ
لەناو مانگی کپ هەڵگەڕای دڵی منا
بێ دەریا ئەسووڕێنەوە
منیش بوومەتە ڕووبار و
بێ هەوار ڕێگە ئەبڕم، بێ کەنار سەرئەنێمەوە
هەموو ئێوارە پاییزان
کە خوێن لە لەشم ئەتۆرێ... دڵیش لە سیمای تەنیایی
سەرم لەبیر چاوانیشم لە بینایی
پێ ئەگرم و ئاسۆی یادم
لە تاو پەرتە عەشقی تۆدا ئەهۆنمەوە
ئەمجارەیان کانی پێڵوی بەردەڵانی ئەباراندە ڕوومەتی چیا
خەم درندەی برسی و قاتی بەرئەدایە پێدەشتەکان
بێ دەنگی چەم خەرەندێک بوو... کلی مەرگی ئەکردە چاو
منیش هەموو لەش و هەستم بوو بەفرمێسک
ڕژامە ناو کەلێنی ماچی تۆراو و سایەقەی یادی بەجێماو
ئای کە ئازیز گەورەتریت لەوەی کەوا
پشکۆی سووری بیرەوەریت وەک ئاگردانێکی جێماو
هەڵپوکێ و سەر بنێتەوە
گیانە هەموو ئێوارەیەک





که دەستی یاد دێت و وەکو شەو سوارێ
سەرم لەگەڵ خۆیا ئەبات
دووریت ئەبێتە هۆنراوە و
بەچەمی شانی غوربەتا دێتە خوارێ

زستانی ١٩٧٨



## ئاسۆ باران

*«چەند جوانە مرۆڤ لەم سەر زەوییەدا شتێکی فەرامۆش نەکراو بێت»*
*«...»*

(١)

شەو لە دەرگای دڵی خۆم دا
چەمی چاوی رووبارەکان هەور و خاکیان ڕائەماڵی
ڕەزەکان تەرمی بارانیان هەڵگرتبوو
شنەی کەژ و کێوەکانیش
شەو ڕەهێڵەی ئەستێرە بوون
بەسەر چۆڵی کیشوەری ناو لەشی منا
ئەهاتن و ئاوا ئەبوون
تۆش کلاَفەی نامە و خەمی هەوارێ بووی
پۆستەی خوێنت لە دەماری نەخشەی منا
ئەوەستاند و تالاَن ئەکرد
تۆش کەپرێکی کوێستانی ناو دڵی من بووی
خەمی -خالید- لەناو لەپی تۆدا ئەمرد

(٢)

هێمن... هێمن
ئەمشەو چرای چاوەکانم گرتە دەست و
لە دەریاچەی لێکدانەوەی بێ سنوورم
شەپۆلی باوکی تۆراوی تۆم دۆزیەوە
بەفری چاوی تۆی لە کێوی دڵ ئەکرد و
بۆ دیدەنیت ئەتوایەوە
چیتر چاوت با فرمێسکی پاساری خوای لێ نەنیشێ
جیهان لە سێدارەی کپی





شەوانی تەم و تاریکی ڕائەپسکا
بەڵام ئەویان پارچە ئاسۆیەکی سوور بوو
بەسەر مێرگی بیرەوەریت سەمای ئەکرد ئەخولایەوە

(٣)

شەو لە دەرگای دڵی خۆم دا
هەور عاشقی هەوراز و چەمەکانی بادینانە
ئاسمانی خودای ڕائەخست
بۆ نامەیێ شنەی ماندوو ئەنوشتاوە
کێ ئەزانێ من جیهانم لەناو دڵم حەشارداوە

(٤)

هێمن دەستێکی بچووکە چراکان دائەگیرسێنێ
+ تۆ چیت ئەوێ بەم شەوە توش و نەهاتە
– لەم گۆڕەپانە ئەگەڕێم هەوارێکە
هاوینان خالید سێبەری تیا ڕاو ئەکرد
بۆ چەتری خاک و سەری من
خەونی سەوزی تیا چەپک ئەکرد
گەنجینەی تیا ئەدۆزیەوە
بۆ هەژار و لاتەکانی ئەم وڵاتە
+ ئێ چیت ئەوێ هەرچی مابوو
لەگەڵ هەورەکان ئاوابوو!

(٥)

شەو لە دەرگای دڵی خۆم دا
هێمن سەرچۆپی مەرگێکی وەرگرتبوو
چرۆی خۆری بەدواوەیە
بیرەوەری (لالوبی) تیا ئەلەریەوە



هەوری ئەکردە پردێک و بارانیش وەکو مێگەلێ
بۆ خاکی دوور و تەنیایی ئەپەڕیەوە

(٦)

+ تۆ بچووک نیت
– بەرزم وەکو ئەم چیایە
+ تۆ بچووک نیت
– چونکە دڵم خالیدی باوکمی تیایە

١٩٧٨

## خاک

ئای ئەم خاکە چەند دڵگیرە
چۆن مرۆڤی فێرە عەشقی خۆر کردووە!
ئای ئەم خاکە چەند تێکەڵی
چەمی سووری خوێنم بوو
بۆیە دڵم وا گەورەیە و
سەرانسەری ئەم جیهانەی هەڵگرتووە!

١٩٧٨



## شیوەن

چاوەکانت دوو کۆتری خەم ڕەوێن بوون
بەڵام خەمیشیان زۆر پێ بوو!
پێم نە وتی؟
خۆشەویستی دەریایەکی گەلێ قووڵە
پێم نە وتی؟ هەیە ئەستێرەیە و جوانە
بەڵام ئەڕژێ و لەبار ئەچێ!!
پێم نە وتی؟ عاشق هەیە ئەسووتێت و
هەشە عەشقی لە یاد ئەچێ؟!

١٩٧٨

## زوێربوون

لە دەرگات دا
نەتئەزانی منیش وەک تۆ بریندارم!
بۆ یاخی بوویت
ڕاستە کاتێ منالّی ڕووت یاخی ئەبێ
پێستەی دلّی خۆی جێ دێلێ!
جەژنی لە دایکبوونی خۆی
بەمۆمی نینۆک ئەکێلّێ
بەلاّم خۆ منیش هەژارم
مۆمێک نییە لە ژووری سەرما گولّ بێت و دایگیرسێنم
منیش پەنجەرەیەک نییە بیکەمەوە
هەتا دونیای تیا ببینم!

١٩٧٨



## خەونی بەهاران

(١)

عەشق
چوار پەپولە
بۆ مژینی شیلەی گولّێ کەوتنە جولّە
ئەوەندە دەمیان لە دەمی ئەو گولّە نا
پاش ئەوەی هەر پەپولەیێ
بەبالّ کەوت و دەمی سڕی
گولّیش بوو بەپەپولەیێ
لە شەققەی بالّی دا فڕی

(٢)

بەراوردێ
لە تەک شاخێکی بچووکا کانییێ چاوی هەلّێنا
کچێ هەروەک پەری خوایی
قژی زەردی دائەهێنا
+ کچ ئەلّێ ئای ئەم کانییە چەند بێگەرد و ڕووت و جوانە
– ئاخۆ ئەبێ ئەم کانییە جوانتر بێ
یا ئەم کچە خانەدانە؟!

(٣)

دووری
ئەی کچی دوور هەر چەند ئەشزانم ئەستێرە
هەوارێکە وەکو دار و بەرد و زەوی
وەکو خاک و خۆلّی ئێرە
بەلاّم دووری شەوگارێکی پڕ لە ژانە
بەلاّم دووری ئاخ بۆ دووری
کە چاوگەی خەمی ژیانە!

## حەزێکی ڕۆمانسی

*«گەردونێکی گەورەیە. گەردونی شیعر»*

*«بودلێر»*

گەلێ ئەستێرە ئێواران
حەز ئەکەن لە پەنجەرەی من هەناسەی شەو بخۆنەوە
گەلێ چۆلەکەی ماندوبوو
ئەیانەوێ خەمی دووری
لەنێو کانی هۆنراوەی من بشۆنەوە
چەمیش کاتێ کە بارانی لێ نابارێ!
لەناو چاوم دائەکەوێ
گیانەکەم زۆر کچیش هەیە
گەر هۆنراوەم کەزی هەستیان دانەهێنێ
قەت قەت خەویان لێ ناکەوێ
بەڵام ئازیز ئەو دڵەی من پاساری ناو دارستانی شاخ و داخە
لە جۆلانەی غەریبیدا چۆن ئەسرەوێ؟!
تۆش کە کچی ناو سەد هەزار بەرد و داری
گەر ئەستێرەی هەموو دونیام لێ ببارێ
من هەر نامە بۆ نیگای سپیت ئەنێرم
لە فەرهەنگی نەخشەی جوانی
من بەتەنها نەخشەی چاوت هەڵئەبژێرم

بەغدا
١٩٧٨ - پاییز



## شەونزا

سەدان وەرزە کچی خەمگین
من دەمەوێ دڵۆپ تێکەڵ بەدەریای هەستت بم
وەکو هاژەی ڕووبارەکان هەڵکشێم و
تێکەڵ بەچەمی مەستت بم
من دەمەوێ هەموو شەوێ بێم و لەبەر تابلۆی چاوت
دڵی ماندووم وەک چۆلەکەی بچکۆڵەی شەوانی پڕ خەم
دابکەوێ
پێچە کلۆی خەمەکانم لەنێو کاسەی چاوانی تۆ بتوێتەوە
گیان بسرەوێ
تۆش دووریت و دووریت گرێکە گشت شەوێ
خەرمانەی ئارامی تەمەن ئەسووتێنێ
تۆش دووریت و دووریت شەپۆلی دەریایە
شەوان چراوگەی هەناسەی بیرەوەریم پێ ئەکات و ئەخنکێنێ
وەرە گیانە بێ هاودەم و بێ لانەمە
تەنها منم شەوان پشکۆی خەمەکانم
چۆڵ چرای تاقانە

١٩٧٥/٩/٢١

# ئەمە سێیەکانی ڕۆح

هەر شیعرێ لە ڕۆح بترازێ

هەپرون بەهەپرون دەبێ...







## میدۆزا

له خه‌وێکی نه‌مردا بوو
چاوه‌کانی بڕیبووه ئه‌و دره‌ختانه‌ی
تامی بارانیان نه‌کردبوو
قاچی له زه‌مین دووری بوو و تاوی ده‌دا
بروسکی ژێر سمی ئه‌سپی
وه‌کو ئاوێنه‌ی ئه‌به‌دی
سامالّی به‌ئاسمان ده‌دا
گیانی شه‌لاّلی ئاره‌قه و له‌زه‌ت بووبوو
زستانی له په‌ڕه‌نگی خۆیا ده‌شارده‌وه
زریانی له خۆی لول ده‌دا
چاوه‌کانی وه‌کو دوو پشکۆی تووڕه‌ی
چاخه به‌ردینه‌کان
دڕیان به‌دارستان ده‌دا
تاشه‌به‌رد و که‌ڤری ده‌کرده مرۆڤ و
به‌دۆڵی مێژووی وه‌رده‌کرد
پرچی مێژووشی ده‌کرده که‌زیه ماریّ
له لولاقی خوای گیر ده‌کرد
که‌ونی به‌دڵ و په‌ڕه‌ی خوێن گه‌وره ده‌کرد
وه‌ک کۆترێکی سپی و ده‌نوکی خه‌نه‌یی
له دوای سه‌د کێو شکاندنا
له شاخانی گرتبێته‌وه
لیسی بۆ له سینه ده‌کرد
سیسته‌می ئه‌و سروشتانه‌ی
له بنه‌ڕه‌ته‌وه تێک ده‌دا.

١٩٨٣



## مێوانداری

ده‌روونم ته‌ڕ نه‌بوو، شه‌وم دانه‌مرکا
پۆلێ مه‌ل ته‌زی بوون
خه‌نجه‌ری به‌فریان هێنابوو
هاتبوون په‌نجه‌ره‌م له وه‌رزێ دابگرن
کرۆسکی مه‌رجان و باده‌می قه‌تێ بێ
کوکوختی بارانم بۆ ڕاوکه‌ن
هاتبوون بیابانی به‌رچاوم
له کاژی غوربه‌تی ئاو لول ده‌ن
هه‌ورازی ماندوویيم بکه‌نه کوێستان و ڕاسته‌قان
چاوه چوکه‌کانیان
ئه‌ستێره و گه‌وهه‌ریان ده‌باراند
هاتبوون
ئامرازی په‌یوه‌ندی من و ئه‌و دونیایه‌م
لێ قووت ده‌ن
چاوگی ناو ڕسته‌ی دڵی منیان بینی
له بیریان کرد مه‌لن
دوو باڵیان له په‌ڕی که‌تانه
هه‌میشه مه‌خمه‌ڵی ئاسمانیان مێوانه
ئاوه‌ڵی سروشتی خوێنی خۆیان تۆراند
له کولبه‌ی بۆن په‌ڕ و کتێبما هه‌ڵکورمان
زه‌مزه‌مه‌ی کێوێکیان له ده‌نووکدا ئالاّند
ئاگر و برین بوو
لاولاوه‌ی چریکه و خه‌مێکیان له ژووری منا چاند
ڕێزمانی گرین بوو
له بیریان کرد مه‌لن له زمان نازانن





له مەرگی سێبەندی ناو وشە تێ ناگەن
من بوومە ئەوان و ئەوانیش بوون بە من
تۆ وەرە ناو ژووری کاگلی ئەمدیوە
لەگەنە خەنجەری سەرمایی و کرێوە
چۆن بۆتە کوانوی جریوە.

١٩٨٣



## مەرگی چوارگۆشەیی

لەشی خۆمم هەڵگرتووە
پەنجەرەم لە وشەی گازی داخستووە
دەزانم کاتێ ئازارێ
لە بنچکی زامی سینەم هەڵدەتوتێ
هەر وشەیێ ببێتە هودهودی عیشقم
لەو ئاسمانەدا دەسوتێ
تەرمی خۆشەویستی تۆشم
لەناو خوێنم شاردۆتەوە
دەزانم کاتێ لەزەتی سۆفییەکانی ئەو زەمینە
لە خانەقای مات و هێمنیدا دەمرێ
ئەم کەونەیان بۆ ئاسمانە و
مەلی ئەوینی ئەزەلی لێ باڵ دەگرێ
هەڵسانەوەم لە کەوتنما
بۆ ناو قوڵایی ئەبەدی حەشار داوە
دابەزینم لە سەرکەوتنی نهێنیم
بۆ کۆشکی ڕۆحی خوادا -ڕام- کردووە
گرژینەوەی سەر لێوە پڕ بارەکانم
لە ئەشکی چاوی خەمبارم پێچاوتەوە
ئەمڕۆی خۆمم لە بەیانێکی دوورەوە لاڵ کردووە
نەبوونی خۆمم لە بوونی سبەینێدا گرێداوە
ئەو خۆڵەمێشەی دەروونی من دەبینی؟
لە داگیرسانی وەجدی مندا سوتاوە!

١٩٨٣

## ئاستانەی نامۆ بوون

باریمە دوندە دوورەکان
تەختە تاوێر و زەمەندی کەنارەکانم شوشتەوە
جۆگەی هەورم گەورە بووبوو
باران بەگوڕ دادەباری
دەمزانی زستانە شەوێ
فرمێسک و بارانی سەوز تێکەڵ ببێ
مەست دەبم و ئارەزوومە ڕێم قەتاوقەت تەواو نەبێ
درەختی پڕ لقوپۆپی هەستی خۆمم
دایە دەست قۆشەنی مەلی نێو دەروونم
جاری وەهاش بالۆرەیێ
بەسە بۆ شەو سەرهەڵدان و لەناوچوونم
لە ئاگری خۆمدا ڕەوی نێڵەم بینی
زمانیان دەبردە ئاسمان
تۆ لە دەرگایێ وەستابووی
چۆڵی تابوتی مەڕمەڕی بۆ دەکوتای
سەرما ڕومەتی قاودابووی
بێ ئەنوا بووی ناو لەپت تاولی ڕەوەندی چیا بوو
جریوەی زمانی بێچوە مەلەکان شکابوو
لایەکت وەکو بەفری سپی
ڕێبەندانی شاخ هەڵدەچوو
لایەکەی ترت ئاگر بوو
گریانت لە هەوکێ مابوو
دونیا چۆڵ بوو وەک کوچەیەکی بنبەست بوو
حەزم دەکرد تاقە منالێ هەبوایە
لێوم لە ڕومەتی کێشکەی دوربیبایە



فیتەی باران و تەپاڵەم بۆ سەردابا
حەزم دەکرد پیرەمێردێکی کەلۆسیشم دیبایە
هەستی خۆمم دابایە دەست
چیرۆکەکانی درێژی و نەهامەتی
مۆرانەم لە وەردی پانی تەنهایی خۆم بەردابایە
کە بانگم کردی نەتناسیم
ئەگینا ئاگری لەشت لە گیانی منیش بەردەدا
لە دیتنما هەردوو مەمکت وەک کرۆسکی کوێستانی
لەناو مێرگی برینداری سینەی تۆدا کەوتنە سەما
کەروێشکەکانی ناو سەرم سرک بووبوون
زەینت لە پێستی ڕامیان گیر نەدەبوو
بتدیبایە چ برینێکم کەوتونەتێ
ئەو پرچەت هەر لە منداڵی ڕا پیر دەبوو
لایەکەی تر ئەسپەشێ بوو
لە دەشتایی پانوبەرینی عەشقدا تاوی دەدا
من ماندووبووم بمزانیبا
دڵم دەکردە هێلینێ
سێوی دڵم بۆ دەستی تۆ سپی دەکرد
شیعرم بۆ کوز کوز دەکردی
بمزانیبا ترێی چاوم هەڵدەوەرێ
کاژی بەژنم دەکۆماوە
تۆش وەک هەویای من دەمردی
کە بانگم کردی نەتناسیم
بتناسیبام هەنگێ خەمت زێتر شیلەی دڵتی دەمژی
ئەگەر منیش بمزانیبا
خۆم بەپەتی شیعرێ دەکوژی.

١٩٨٣





## سەرکێش

ڕۆحی من ئەسپێکی سەرکێشە کەس وەک خۆم نایناسێ
کەس وەک من جڵەوی ناکاتە گەردەنی
هەندێ جار دەیخەمە ناو لەپم
ڕێگەی تەنگ و توونی پێ دەبڕم
هەندێ جار وەک کۆتری کێویلە و قەللاجی قەڵایان
باڵیم بۆ دەکاتە فەرشیلەی ئێواران
لەژێر سینەی خۆمدا لیسێکی بۆ دەکەم
لە یاقوتی خوێن و لە ڕەهێڵە و باران
لە میانی من و ئەو ڕۆحەمدا سنوور شورەی ئاوە
ڕۆحی من فریشتە و هەرماسە
دۆزەخی کەوسەر و بەهەشتی ئاگرە
ڕۆحی من ئاسمانی ژێر پێم و زەمینی بان سەرمە
هەندێ جار گەورەیە
سێبەری هەموو قوژبنێکی تەمەنم دادەگرێ
کە هەڵدەکشێتەوە دەبارێ
وەک مشتە مەرجانێ دەکەوتە ناو لەپم
دەبێ بەڕەوێ پۆڕ ئاسۆم لێ دەکەنە مرواری
بۆم دەبتە شاباڵی ڕاستەوانە و چەپم
هەندێ جار بچووکە
بریقەی ون دەبێ لەناو خاک و خۆڵ
بۆ تاکە زامێکی مێرولە
بەفری ڕۆح دەبێتە ئاوێکی تەنک و هەڵدەچێ
ﺑﻜەنە کێڵگەی ئارد و ڕمیش
ئەو ڕۆحەم لێ دەبتە کەپکە شاخ و پۆڵا



تاوسی ئارامت لە دەریاچەی زیوی سامالدا ئاو بدە
ئەی ئەسپی غەریبم لەو بارانە گیانم شەڵاڵی لیم
بووە
هەر تخوبێک ماوە چوار ناڵە تاوبدە.

١٩٨٤

## زۆربا

(١)

پەریەکانی ئەم ڕەوەزە شاخ و داخە
ئەوەندەی حەز لە شەرابی چیا دەکەن
ئەوەندەی لە نکاڵ کانی
شەمشێر لە جەستەی بێزاری و خەفەت دەدەن
لە ئەویندارى نازانن
ئێستاش لەو سەر ڕووبارانە
چاوەڕێی سن میناس دەکەن
بەسواری ئەسپی کەرەندی لەسەر کۆلانان دەرکەوێ
یۆنان وەک کچێکی عازەب
بخاتە سەر زینی نوقرە و بۆ کلێساکان سەرکەوێ!

(٢)

خەونم بەچەمێکی خوڕ و گەورە بینی
جۆگەلەکانی برژێنە گۆمە مەنگەکانی کرێت
بچمەوە سەر ئەو -دێر-انەی
فەریکی فرمێسکی زۆری
لێ وشک بوو و ڕژایەوە؛
کە بەیانی لە خەو هەڵسام
ئاوازێک بوو لەناو ژێی ژێر پەنجەی منا توایەوە.

(٣)

لە خانووە گەچ و بۆرەکان گلۆت گلۆت خوێن و کرتە
لە ئاوێنەی بچکۆلانەی بەرگی سوخمەی کچۆڵەکان
لەبەر پێی خاچی مەسیحا بریقەی دەچێتە ئاسمان



تێکەڵ بەگۆڵی شار دەبێ
ئێستاکەش تک تک هەڵدەڕژێ
کچان نەزری پێ هەڵدەگرن
ژنان لە دەست پێ دەدەن
پیاوان سوژدە بۆ شەفەقی بەر پێی دەبەن
لەگەڵ کۆنیاکی نۆش دەکەن
منیش لە تەنبوری دەنێم
ژێی ئاوازی پێ خۆش دەکەم

(٤)

ئەمشەو بۆ گوندێ ڕێ دەگرم
ڕێچکۆڵەی بەقەد ڕەوەز و درەختەکان تێ بپەڕێ
ئەمشەو زامێ لە هەوای خۆم سارێژ دەکەم
هەنگی ژانی تێ بگەڕێ
ئەمشەو نەوایێ دەچرم گڕ لە تەمبورەکەم بەردا
ئەمشەو چەشنێ دەنرکێنم
سوڵتان ئارەقە بکات و دەست لە خنەی یۆنان بەردا

(٥)

پەندورێکی سەدا هەنگوین شانەی لەشم هەڵتەکێنێ
خۆم لە هەواری ئارەقە و ماندووبوونا بدۆزمەوە
ڕووبارێکی بێ سەر و شوێن هەڵمگرێ و بمدا بەدەم
زەریاکەوە
بارانێ توند تەزرە بێنێ و سەری گەرمم بکوڵتەوە
من هەر زۆرباکەی جارانم
پرسە و شایی
بنگەوەری پڕ لە ڕەژووی بێ نان و ئاو





کرێتی ناو دەمی گورگ
نامکاتەوە مرۆڤێکی تۆ ئاسایی
دەرگاکەتم لێ بکەوە زەری کاڵفام
قفلیش بدەی من هەر زۆربام.

١٩٨٤



## تەمە سپییەکانی رۆح

(١)

گوێ بگرە
من چەمی مەرجانی خوێنی خۆم بەردەدەم
باشوکەی خوێناوی جەخاری ئەو دڵەم
بەر هەڵلای درەختی شین دەکەم
ئێواران بۆ ئاسمان بڕوانە
قەتاری تەنوران دەبێنی
ئەوساکە تۆش وەک من لاولاوەی بێزاری
لە دەوری ڕۆحی خۆت دەچێنی.

(٢)

«کودەری شەویان لە جەستەی غوربەتی خۆیان پێچابوو،
سینەیان پڕ لە قەڕنەفلی برین بوو،
کەوتبوونە ناو گۆلی مەرگ و شەوی درێژی پڕ زریان،
خەونی خۆیان لە ڕاستییەکی ئەزەلی شەتەک دابوو،
هەبوون و نەبوونیان لە یەکتر
دەئالاند»

(٣)

ڕەشبەڵەکی ئاگر و ئێسقانم دەبینی
چۆن تێکەڵی یەکتر دەبوون
مەرگ و ڕۆحی سپی فریشتەم دەبینی
سەر و کۆکڵی یەکتریان دەڕنییەوە
گرانە... گرانە
وەک پاییز و زریان و تۆف
سوکە وەک ئاڵتونی خوێن و
مەرجانی ناو چاوی مرۆڤ





(٤)

شیعر نەبا من مرۆیەکی سەقەت بووم
شیعر نەبا جوزامی مێژوو دەیخواردم
لوتکە گڕی تێبەردەدام
قەلی غوربەت لەناو وەردی برینمدا
لە خاچی شەوی درێژی خۆیان دەدام

(٥)

سوسنی دڵم پیربووە
ئێستا لەوسەری پیرییەوە
بۆ ناو گەڕەکی منداڵیم دەبەنەوە
لە میانی ئاسمانی نێرگز و زەمینی ژاڵەدا
گوناهی من
گوناهی گوڵە کێویلکەی لوتکەی دوورە
گوناهی من
گوناهی ڕووبار و ئاوی کوێستانان و ئاسۆی سوورە.

(٦)

تەمی ڕۆحی شلەژاوم
ئەستێرەکانی لە جامی کاڵ گرتووە
لەناو زیخی نائومێدیدا ون دەبێ
من خەمبارم
سەیرکە چۆن ئەو ڕۆحەی من دەتوێتەوە
دڵی غەریبم پیر دەبێ!

(٧)

کەپکە شاخی شیعری سەختم ناوەتە کۆڵ
ترپەی دڵم بۆنی باران و پروشەی بەفری لێ دێ

١٩٨٤



## هەرێمی حەوانەوە

هاتن و تەرمەکەی چیایی سەر شانیان
بەپشکۆی کۆڤانی جەرگەوە دەسوتاند
دڵی خۆیان نابووە سەردەست و
بۆ سینەی وەثەنی ئەو گریان
قەرار بوو هەموویان فرمێسکی ئەڵماسی بێ دەنگی
لە پەنای چیاکە جێ بێڵن
ئێسقانیان لە بۆنی خاکەوە نەرم بێ
قەرار بوو جەستەیان بۆ خاک بێ و ڕۆحیشیان
کۆتری گورمیلەی سەرکێڵی تەرم بێ
ئەو ناوەش جەنگەڵی تاریکی ئەجەل بوو
دوا گرێی نێوانی سەرتا و ئەزەل بوو
بەکۆمەڵ سەریان نا بەسینەی ئەو تەرمەی بەکرێ
ڕوخساری نابووە ناو کلێسای مەرگەوە
پێکەوە چوونە ناو ئەبەدی و نەمری.

١٩٨٥

## بڕیار

بزانم دوا مەلی خاڵ خاڵی وشەی سوسکە دەنگ و
کاکۆڵی
لە بن باڵ و دەفەی کەڤراوی نێو سینەی من دایە
شەختەی ناو قوتبی ئەو دەروونەم دەشکاند
پەراسوم شەق دەکرد
ئاگرم لە گوڵی توتنێ بەردەدا
تولازیم نەدەکردە -بوزا- بۆ پەرستگای پیری
دڵۆپێ خوێنی خۆم لە بناری شاخی بێ دەنگی لێدەنا
تا هەتا بەرماڵی هۆنراوەم دەق دەکرد
خۆم لەسەر تاخچکەی هەورازێ دادەنا
دەچوومە خانەقا و کونجی گۆشەگیری.

١٩٨٦



## کەپری خۆڵەمێش

دۆڵێکی زۆر تووشە بەفرێکی ئەستورە
سنوری ئەوینم لە باڵای بریندا کێشراوە
برینیش کە سەرما لێی دەدا تامووخی خوا دەڕوا
شەمشێری ڕوخساری تۆش کاتێ بەگیانما هەڵدەکا
ئەو دۆڵە لە خوێنی کۆڤانم شەت دەکا
ئەو باڵەی وەک باڵی (ئیکاروس)
بۆ دڵی خۆم کرد و هێنا بووم لەو دوورە
لە تیشکی ناو لەپت بوو بەئاو
ئەو خەمەی من ڕستم
وا بۆتە ماهوتی ئەو بەفرە ئەستوورە.

## ئۆلیس

که شەو هات لێم پرسی بۆ هاتی
کێ تۆی دا بەناو ئەم هەوارە دڕکەزی و بەیارە
کام دێوی مەرگەسات ڕاوی نای
بۆ گۆڕە غەریبەی هامۆنی خۆی بردی؟
کام –نبتون– ئاودیوی خەرەندی بێ بنی خۆی کردی
که شەو هات لێم پرسی تەرمت دی بێ سەر بێ
چەمت دی لە دەمی زەویدا وشک بێ و مردبێ؟
یا کەللەت دی کەوا مێروله
هێلانەی تەمەنی لە قەپێلکی چاوا
بۆ خۆی و هێلانەی کردبێ؟



«...»

بۆ کوێ دەچیت ئەم زەمینە زۆر گەورەیە
کاسەسەری تۆش بچووک و زەنگیانەیە؟
بۆ کوێ دەچیت ئەم زەمینە زۆر بچووکە
ئارەزووی تۆش زۆر گەورەیە؟
جێی عیشقی تۆی نابێتەوە
تۆ دەبێ یا ڕەگ و باڵا و قەد و سەرت
خوێن بۆ ئەم کەونە بەرینە بازرقەدا و دەرگای
برینت کەیتەوە
یا ئەم زەمینە بەقەد خۆت بتراشی و بچووک
کەیتەوە!

## ڤالیۆم

ئەوە لم نییە نا برادەر
بیابانی مەرگ و زریانی کەپکە شاخی خۆڵاوییە
غار لە سواری ڕێ دەسێنێ
مینای زمانت دەشکێنێ
ئەم هەوارە ڕەشەمەی چامەی درێژی ڤالیۆم بارە
ڕەشەمەی دڵی تەنەکە و عاتیفەی ناو قووتی مزە
خەونی تەلی و ئەوینی ئەو شەمشەمانەن
چاویان لەبەر هەتاوی سبەینێ کزە.



## شەمشێر

دەستت لە بنج و دەوەنی ئەم گرد و خەرەندە قووڵە
گیر کردووە
دەتەوێ لە هەڵدێرانا بەرەو ترۆپک سەرکەوی
کەمەری خۆت لە بڕبڕەی درەختێکا شەتەک داوە
دەتەوێ لە فەرشی پڕی دارستانێکا دەرکەوی
ئەسپە شێکەی خۆت بەجێ هێشت
دەستت کردە ملی بڕستی و کەشەنگی
لە پەنا پەسوێکا خەوتی
ئەگینا ئێستا لە کەنار خۆرەتاوا سواری بووی
وەک بریسکەی شەمشێر و خوێن
بژویالی ئەسپە حدودت ڕەنگ دەکرد
لە دوندێ وەدەر دەکەوتی.

«...»

من لێرە سنووری مەینەتی مانەوەم پێ نییە
من لێرە بۆ ساتێک مەرگی خۆش
لە بستی ژێر پێما زیاتر جێم نییە
کە هاتی قامچی بوو تاجی سەر برینی ئەو سینەم
تۆ سینەم نابینی بۆتە چۆن درەختێ
بارانی مەلی خوێنی تێدا کەشەنگ و شەکەتە
تۆ چاوم نابینی چۆن بەناو هەنیەما
ون بووە و ڕوو چووە لە تەمی غوربەتا.



**جەنە**

سەیرکە دڵی تۆ و ئەو خەمە دژوارە
سەیرکە مەلەی تۆ و ئەو چەمە گێژەنە
سەیرکە ڕەگی ئەو درەختە و خوێنی ئەو بنارە
سەیرکە پەنجەرەی برینی شاعیر و ئەو بایە بێزارە
سەیرکە لاشەی خۆر ئەو داڵە برسیە
سەیرکە سینەی من لاولاوەی خەمێکی کەڵەگەت
بەرلەوەی کۆرپەکەی ڕوانینت لە کەپری چاو بمری
سەیرکە گرویان گرتووە و ئاڵاونە یەکتری.

## ئاڵۆزی

ئاگرێک پێ دەکەی گەردنەی کێوێکی تەنکە
لایەکی دۆزەخی -باربوس-ە و ئەوی تر بەهەشتی
-دانتی-یە
چراکەت هەڵگرە و هەردووکیان جێ بێڵە
نە دۆزەخ ڕەشۆڵەی سەرمابووی دەروونت گڕ دەدا و
لەرزینت قاو دەدا
نە بەهەشت بارانی کۆڤانی ناو سینەت کپ دەکا و
حاجیلەی هەناوی کێلڕاوت ئاو دەدا.



## قرژاڵ

ئێستاکە من ڕێگەم هەر یەکە و ئەو هەزار
کاتێ کە پێک دەگەین جارجارە دەگرژێ و
جارجارە تووڕە و توند
دەزانم ڕۆژێ دێ چەنگاڵت لە ڕۆحم گیر دەکەی
خۆشحاڵم بەو ڕۆژە
چونکە من ڕۆحێکی سەرکێشم
دڵی خۆت لە دەستم پیر دەکەی
من بەفر و تۆ باران پێکەوە هەڵناکەین
کە هاتی دەمامکی خۆت بدە
بمناسی چەقۆکەت تور دەدەی چاویشت شل دەبی
تا دەمری گیرۆدەی قرژاڵی برینی دڵ دەبی!

## ساتێ بۆ مەرگ

که دڵم تەنها بوو و وەرسی لە خاچی خۆی دەدا
ئەو شاخی نابووە کۆڵ
که خوێنم دەسوتا بەزەیتی ئەوینێ
ئەو کەپری لە باران دەچنی بۆ مەلی کەشەنگی
دەگریا دۆڵاو دۆڵ
کاتێ من گوێچکەی خۆم بۆ بەستەی ئارەزووم شل
دەکرد
ئەو چووبووە هەرێمی خاک و خۆڵ
ئێستاکە ئەی زۆربای خۆمانی تەمبوری تۆ کوانێ؟
من تەنهام کەوتوومە ناو ئەڵقەی چۆڵ و هۆڵ!



## سزا

ئەو خوێنەم وەردێکە چرا و خەم، برین و بێ دەنگی تێدایە
ئەو دڵەم شارێکی وێرانە و غوربەتی تێدایە
چاوی من چەمێکە فرمێسک و ماسیلەی ئازاری تێدایە
تەمەنم کێڵگەیە و دەوەنی ئەوین و سوتانی تێدایە
قەڵەمم پاسێکە گریان و سەفەری کۆتایی تێدایە
دەستیشم بەردێکە ڕوخان و دۆزەخی تێدایە
بوونی من ئەم کەونە بچووکەی وەک دەمی دەولکە
تا دەمرێ سەرەو ژوور بۆ ناخی تاریکی و تەنهایی
هەمیشە لە کۆشی ڕێ دایە.

## ئەبەدی

ئەوینی کەپکە شاخ لە مووخی زەویدا چەسپیوە
تا هەتایە
بسکۆڵەی هۆنراوەی نالییە لە چەمی شارەزوور
شین بووە
سێبەری ئاسکە لە شینی چیادا رووچووە
ڕوحەکەی مەولەوی تا بەرزە خانەقای گرتووە
شاباڵی هەڵۆیە تا دەمرێ
لە ترۆپک و باڵی ئاسمانی شین دەفڕێ



## ئەڵقەی بۆش

تا چاو بڕکا ئەم زەمینە هەر خاڵییە بەرچاوم پڕ ناکاتەوە
هەر چەند بەسەر سەبەتەی ڕێ دادەپڕژێم
نارنجی دوکەڵی دەستم بری تەمەنم ناشکێنێ
کە تیتروا‌سکی بینابیم گەورە دەبێ ئاسۆ بچوک دەبێتەوە
کاتێ ئاسۆش برینی لێ دەکەونە لەش خۆی دەکوژێ
بەسەر تەرمی خاک و خۆڵدا هەڵدەگەڕێ
بینایيم لێ بچوک دەبێ و ڕەنگی دەروونم دەپەڕێ
کە چاو بۆ چەمێ هەڵدەبڕم سەرم بەئاسمان دەکەوێ
کە دەمەوێ لە جغزێدا باوەش بەدەروونی خۆم کەم
قاچم لە زەوی گیر دەبێ...
سەردەکەوم دەگەم بەناخی بێ دەنگی زەمینەوە
دادەبەزم سەرم لە بەفری ئەو ترۆپکانە پیر دەبێ
وەک شا تاجی شلک و نەرمی بنەگەزێ گەرەکی بێ
لە زریانی بەفرانبار و ڕێبەندانا سەرهەڵبدا
هەناری ڕومەتی بکوشێ و خۆی بەملاو بەولا دابدا
تا وەختێ دێ خۆی لە سامالّدا بپێچێ
تەمەنیشی لە گێرمە و کێشەی شین بوون و
پوکانەوە بەسەر دەچێ.

١٩٨٦

## سێوی مەرگ

– بۆ وەی لیمۆی ئارەزووی خۆم
بەدەست و پەنجەی ئەم کەونە دابهێنم
دەبێ ناکۆکی دژەکان کەم کەمەوە
دەبێ سمۆرەی ئاگر و پشکۆی برین کەوی
بکەم
لەم ئەبەدیەتە نادیارە خۆم لە مەرگ ڕابهێنم
گورگ خوانی دارستانی لەلا کەمە و بۆنی ناو
لەپی من دەکا
وەرە بۆ ناو کۆختەکەی من
خەڵوەتی کێوی ئارامی لێ شێن بووە
سەرپەنجەکانم لە ڕمی قەڵەمی شەمشێر
گیربووە
– بۆ وەی دەستم لە پێستی زەردی ئەم کەونە گیربێتەوە
دەبێ چاوەڕێی لالێ بم
وشەی مەل و ئاوازی ئاڵم بداتێ
دەبێ سەرخۆشێ بەدی کەم
هۆش و ئاگام وەدی بێنێ
بەزەوی پانوپۆڕ بلێم بالۆرەی ناخیم بۆ بلێ
بەبیابان بلێم لاوکی دوند و ترۆپکان سەربدا
بەئامێردی خەونم بلێم لەبەر چاوی من ڕوح بدا،
داوا لە لافاویش بکەم بمباتەوە ئەو شوێنەی
منی لێ هێنا
وا لە سووری خوێنم بکەم بەپێچەوانە خول بخوا.
– بۆ وەی دەستم لە پێستی زەردی ئەم کەونە
ئازاد بکەم



دەبێ زیندوێتی خۆم لە تەرمی سوارەکانا بدۆزمەوە
تیترواسکی بینایی خۆم وەکو گوێ زرمەی قاشوانێ
لە نابینایی ڕووبارە کوێرەکانا بقۆزمەوە.
– ئەوە چییە لەناو خوێنم بەندی غەریبی
دەخوێنێ؟
بارانە دەبارێ یا ستونی کەونە دەڕووخێ
گریانە قۆنداغ کراوە
یا زیرەی ئەم کەونە کاسەیە لە زامم
وەرپێچراوە؟
– ئەوە لەو هەڵەتانە چی دەکەی؟
ئەی کەتانی عەشق و میهر
بۆ دوو دەست و دوو قاچی خۆت
بۆ دوو چاو و دوو گوێچکەی خۆت
ناوەتە ناو خورجینەی ئەم ڕێ و بانانە؟
بەدوای چەند دێڕێ دەگەڕێم بمکاتە سوڵتانی شیعر.
– ئاو لە کوێ بێنم ئاگری تەقەڵای خۆمی پێ خۆشکەم؟
ئاگر و پەڕەند لە کوێ بێنم پوشی دەروونم سەر خۆشکەم؟
دەمەوێ بزانم کە مەلێ دێ دەخنکێ چی بەسەر دێ
کە باران دەبارێ زەوی چۆن چۆنی شاگەشکە دەبێ
بۆ وەی دەستم بەکەزی نهێنی بەخشی ئەم سروشتە دابهێنم
دەبی ورد ورد خۆم لە مەرگ و دەمی شەمشێر ڕابهێنم

١٩٨٦

## گوڵی پێوانەیی

### گوڵی زوقم

تەرمێکم زیندووتر لە بتی ئەبەدی ساتێکم درێژ تر لە سەدە
دەمەوێ کلێپەیێ لە خوێنی دڵ بەردەم گەورەتر لە دۆزەخ
بناریێ لە وشە بچنم بەرزتر لە لوتکە خۆمی تیا دارێژم
چۆن ئەم ڕێیە ببڕم کە دێم ڕوخسارت خۆڵەمێش
دڵی من ئاگرە
کاتێ کە پێت دەگەم ڕوخساری تۆ گڕە و دڵی من خۆڵەمێش

### گوڵە مار

دەهاتم زانیبام ڕێگاکەم کورتە وەک ڕێگاکەی
شاری هات و نەهات
دەهاتم زانیبام لە شوێنێکی نزمی وەک ئاسمان
دەهاتم زانیبام بەرزی وەک پەنجەی پێی شەڕەفخان
جامێکت دا بە من ژەهر با باشتربوو لەوەی کە بەتاڵ بێ
گوڵێکت دا بەمن حەزیا با باشتربوو لە پەڕێ
بەخوێنی دڵی خۆما ئاڵ بێ.

### گوڵی ئاسمان

هاتبا دەروونم بۆ ساتێ -تەنهایی- وەک ملی
بەفراوی قوڵینگێ گرتبا
تا هەتا لالەی سووری خوێنم دەبوو بەخاوەنی
شا کچی -پشودان-
هاتبا -تەنهایی- وەک سوارێکی هیلاک ڕێشمەی
ناو لەپی خۆی
لە بڕی سەرکێشی ئەسپی سورخنی ناو ئەو خوێنەم کردباوە
لە هامۆنی کەسکا ڕام دەکرد خۆم لە بەرد و دار و



زەویدا لول دەدا
خەریکە بباریێ لەو دوورە خوێنێ خۆم دابایە ئەم
گەواڵە هەورە
ئێستاکە ئاسمانی بان سەرم دەبوو بەمەلەکوتی گوڵێکی گەورە.

### دەمارە گوڵ

بۆ وەی تۆ لە -دوندێ- ببینم دەبێ خۆم بچمەوە بناران
بۆ وەی تۆ لە -هەورێ- ببینم دەبێ خۆم ببمە
جێ پێیی دڵۆپە باران
بۆ وەی کەپێک بگەین دەبێ یەک زەوی بین
ئەوی ترمان ئاسمان
ئەگینا ڕیسە گیای ئەوینمان جەستە مات و مردوو شین دەبێ
ئێمە بەو مەودایەی نێوانمانا بەندین
وەک گوڵێ دەماری خوێنی لە بارانی دڕوو دەربخا
دەبێ یەک قاچی من لە زەوی خاک و خۆڵ دابگرێ و
ئەوی تر تۆی سوسکە بۆ ساماڵ سەربخا.

### کۆلارە گوڵ

کە جەستەی خۆم لەناو پروسەی شەمشێردا دەدۆزمەوە
هەست دەکەم منی بچووک کلیلی ئەم کەونە گەورەیە ون دەکەم
کارێزی ئاڵتونی وشە قومری گریانم دەدوێن
زنجیری ئێسقانی سینەم دەترازێنم قەتێی خەونە
ئاوییەکانم هەڵدەفڕن
کۆلارەکان پەڕ دەردەکەن بەسەر تەرمی زیندوی منەوە دەخوێن
دەزانم دەمرم و جەستەی خۆم لەناو زریانێ دوندەکەم
هەست دەکەم منی گەورە دەرگای ئەم کەونە بچووکە دەدۆزمەوە.





## گوڵی با

ئەگەر بام لە دەست بێ دەتوانم خوێنی خۆم لە
جامی لەشم دا بگۆڕم
باشوکەی بیناییم بگرم و ئاسۆی خۆم بەرین کەم
ئەگەر بام لە دەست بێ دەتوانم لە زمانی بەفر و
باران و کرێوە سەر دەرکەم
کەوانەی وەستان و نەبزاوتن بشکێنم
ژمارەی پەنجەی خۆم زێترکەم
بەچاوی دیتنم ببیستم و بەگوێشم ببینم
ئەگەر بام لە دەست بێ دەتوانم جاویدانی و
ئەزەل لەناو خوێنی خۆمدا بچێنم
بەڵام کە مەچەکی شاژنی با دەگرم لە ڕۆحم ون دەبێ
کە ڕەهاشی دەکەم وەک لاولاوەی تەنکی بیابانی
لە ڕۆحم دەئاڵێ

## گوڵی خوێن

لە کرۆکی جومگەی لەشمدا نەماوی و سەقڕی با
تۆی بردە درەختێکی تووڕە
کێ ڕێگەی لۆکەیی ئەو بایەم پێ دەڵێ،
کێ دەستی لە قژی ئەفسانەی با داوە
ئێستاکە تێکەڵی با بوویت و ڕوخساری شوشەییت نابینم
ناوێرم هەناسە هەڵکێشم دەترسم بچیەوە ناو سینەم
ناوێرم هەناسە دەمەوە دەترسم لە دڵم بچیتە دەرەوە
کەس وادەی بەمەرگ نەداوە
گیرۆدەی با بوویە و باش گیرۆدەی تۆیە
لە میانی تۆ و بادا دەروونم کێڵگەیەک برین و چەقۆیە



## گوڵی مەسیح

کە با دەبێتە سوڵتانی ئەم کەونەی مەرجانی ئەشکە
درەختان لە جامی شەختەی مەرگ دەگرێ و دەخاتە
ڕووبارەکان
مێگەلی هەوران ڕادەدا و بەرد دەجمێنێ،
بێخی تابوتی چیاکان هەڵدەکێشێ
کە بەناو سینەشم دادێ بەلوری دڵم شەق دەکا و
چیغی پەراسوم دەشکێنێ
خوێنی لەشم دەکا بەتاڤگەی یاقوت و سەدەفی
دەمم پەرت دەکا
بارانی خەنجەر بانگ دەکا و گوڵی مەسیح لە
هەنیەما دەپشکوێنێ
شەمشێری ڕۆحم لە کاڵان دەردەهێنێ و ڕۆحێکی
تازە مناڵم پێ دەبەخشێ
من چیم؟ کە با دێ گەردون لە دڵم دەشارمەوە
بەڵکو تەنهاییم لە خاچدا
کە باش دەڕوا دڵم لە گەردون دەشارمەوە نەبا
هەست بەتەنهایی کەم.

١٩٨٦

***

## دوا سەفەر

بەرلەوەی برینی ئەو دڵەی هۆنراوە کون کونی کردووە
تێکەڵی شەمشێر و چەقۆکەم
بەرلەوەی هەنگوینی باڵۆرەی شێتی خۆم
تێکەڵی ژەهراوی ئەزەل کەم
بەرلەوەی چوار پەنجەی زام و لاوازم
بگێڕم بەناو پرچی هەورت
بەرلەوەی بمرم و بۆ شیعری گەورەتر
بۆ ساتێ کرێشمەی بارانی نەمێنم
دەمەوێ ئەو چەمە خوڕەی دێ بەشاخ و دۆڵەوە
بەکاژ و لاولاوە و مێرگەوە هەڵگرم
بیخەمە کیسەیێ لە پەراسوی تەن و چاومی حەشاردەم
تا ئەبەد خوڕەی بێ لە تەلانی تژ و دامێنم
ئێواران جار جارە هەڵۆی چاوی زیوت
بفڕێنە سەر داو داوە بسکی ئاسۆی دوور
کە چاوی لە گریان سوور دەبێ
ون دەبێ لەودیوی تەمانی نەیستان
بڕوانە دوا مەلی ئاسمانان کە بولێلان ماندوو
گەروویان لە جریوە داغ دەبێ و
بەبێ دڵ دەچنەوە دارستان
بڕوانە دوا تاولی کۆچەران
کە بارکۆڵەی خۆیان لول دەدەن
دەچنەوە زەنوێر و ترۆپکی تەمینی
هەر شوێنێ بارانی لێ دابێ و
هەور سێبەری خۆی دابێتێ
لەو جێیە دوو چاوی خەم ڕەنگ و شەق شەقی
دڵی من دەبینی

١٩٨٦



## ستونەکانی با

وەرزێکی نادیارە و خۆم لە با لول دەدەم
پروشە لە ڕۆحی شکاوم هەڵدەسووم
تا مینای تەمگرتووی تەمەنم کۆتایی لێ دیار بێ
کێ بوو هات بۆ خەرەندی گیانی لاڵ ببوو؟
هەوری ئەو هەورازەی لە پەڕەی تووڕەیی خۆی دەدا
ئەوینی لە قەندی ماتەمیا بەردەدا
هێشتاکە پەڕەندی وشەمان
لە تەمی سەر تەبەش نەدابوو
ئەوەیان جامی سەر برینە
وەک مینای قەرسیلان خوناوەی هێناوە
کێ بوو هات کەرەندی خوێنی خۆی زیندا بوو
من بینیم دەگریا دۆڵاو دۆڵ نەوای خۆی سەر دەدا
زەردەلوی ڤالیۆمی لە بینای خوێنی خۆی تاو دەدا
شەمشێری ئازاری نابووە ناو پیفۆکی زمانی
شەوڕەوی جۆگەلە و جۆباری لە ئاسمان لادابوو
هاواری پۆڕە مەل ئاسابوون هەڵدەفڕین بۆ ئاسۆ
هەنسک و هەنگاوی شەوڕم بوون لە زەوی دەچەقین
ماندوومە با پەڕی تاووسی ڕوانینم پردی بەر قاچم بێ
با خاک و هامۆنی بەر پێی مەل گۆڕم بێ
دەمی خۆم لە سۆنەی قسە و باس دادەخەم
سواری ئەسپی ئاسۆ و بۆراقی گڕ دەبم
پشتی خۆم لە باری تەمەنی بێ هودەم دەبەستم
ناو لەپم بۆ مەرگ ڕادەخەم
با گیای ئەبەدی لێ شین بێ
دەرگاکان لە هەناسەی سپیم کاڵ دەدەم





تا سینەم ببێتە درەختی چلورە
وا نەبێ بێنی من ناگاتە کوپەی قەوزە گرتووی
نێو ئەم ڕێیە دوورە
نووستووم و خەونێ لە سیپی بێداریت دەچنم
ئەو ڕەزە نامۆیانەی دەورم
ترێی سەرسامیان گرتووە
وەرە خۆت ڕووت کەوە لەبەر بای کۆڤانم ڕاکشێ
چەند خۆشە باران و ئەدگارت تێکەڵ بن
کەون بۆمان بگری و بسکی خۆی هەڵپاچێ
بینابیم قەداوقەد
کۆڵەگەی نێوانی ئاسمان و زەمینە
کەوتوومە باوەشی بایەکی خودایی
وەک دار بی ڕۆخانەی چەمی تاڵ
دەگریم و دەهەژێم
کەوتوومە نێو داوێ
بۆ قەتێی مەرگی خۆم چاوم داگرتووە
ماڵەکان یەک یەکە قەندیل و چرایان خامۆش کرد
ترسێکی داستان و ئەفسانە
هەترەسی ئەو ناوەی بردووە
کێ بوو هات خەرەندی گیانی خۆی ببینێ
دەمەوێ بچمەوە کەفچەڕی دەریایی
تێکەڵی کپی بم
لەو سەرە لە شێوەی ماسیێ
چاوی لە مەرجانی ئاڵ بچێ بێمەوە
بۆ ئەمشەو مۆمی داگیرسێنە عەنبەری خوێنت بێ
منداڵیم بکاتە ڕەهێڵە و دابکا



دەمەوێ ئێستاکە تامی منداڵیەتیم وەرگرم
ئەسپێکم بۆ زین کە جحێڵیم بۆ بگرێ و
لە پەرێزی تازە و سەرەتا ڕا بکا
کازێوەم بۆ بێنە و بیخەرە سەردەمی پشکۆدانێکی کۆن
با زستان مێوانی دڵم بێ
بمخەرە ئەشکەوتێ
چرۆی کێوی ڕەوەز دەرگای لێ دابخا
کە لاولاوەی هاوار بەباڵای بێ دەنگیم هەڵگەڕا
لایەکم خەون بوو نیوەکەی تریشم ئاگاهی
جۆگەلە تیژەکان مەداری کەناریان جێ دەهێشت
کەفرەکان ئاگری گلکۆیان گرتبوو درەختیش دەسووتا
ئەو ناوە بێ دەنگ بوو
ڕەشەبا ئەسپی خۆی دابووە دەست پاچەکان
بەفر بوو ڕوخساری سپیپاتی ئێمەی ون دەکرد
لەگەڵیا تێکەڵ بووین
زنوێر و گیا بوو لولی داین
ئاگر بووین خۆڵەمێشی مێژوو قووتی داین!
ئێستاکە من و تۆ لە قەپێلکی هەرێمێکی واین
تەنافە وردیلەی منداڵی و پیریمان پێ
لێک ناکرێتەوە
ناتوانین خۆمان لێک هاوێر کەین
من تۆمە و تۆش منی
چۆن پەنجەم لە لێوت کەمەوە؟
نە خەنجەر دەتبڕێ و نە سیماشت دیارە
هەردووکمان قەفتەمان گرتووە
بەڵام تۆ خێرا دەیوەشێنی تاڵەمووش نابڕێ





منیش کە لە کاڵانی زیوی دەردێنم
لە ئێسقانی شەوی دەشکێنم
کە هاتم بینێمە کەمەرم
ڕەنگی لە شەفەقی سوور دەچێ
وتم بەرلەوەی ڕشتەی هزرم دارژێ
بەرلەوەی مورتکی خەونەکانم سووربن تاوبدە
بچۆرە ناو پەڵەی باران و گەواڵەی بێ دەنگیم
چونکە من کە پەنجەم لە جەرگم گیر دەکەم
کودیلەی تەمەنم شەق دەکەم
بە نەرمی دەگرێیم
کوا قەفی گرێ کوێرەی کەون بە من شل بێتەوە؟
قاچی من بەزەوی نووساوە
ئەگینا ئاسمان بوو مەبەستم
سەریشم لە ئاسمان گیر بووە ئەگینا زەوی بوو
تاوگەیی هەڵدەڕژایە هەستم
– دەچمەوە قووڵترین خاڵی ئەو زەمینە
گەرایێ دادەنێم گەردیلە نەیگاتێ پیس کا!
گەرایێ دادەنێم خشپێکی نەگاتێ
هەبوونیان بیرهێنێ
گەرایێ دادەنێم
نەشازی ڕێزمانی سروشت بێ تایبەتی
سەری خۆم لە بژی سێبەرێ دەبەستم
سنووری چەمکەکان نەمینێ
کە بێمە دەرەوەش ساماڵ جادەی نەرمی بەرپێم بێ
فەرخەکان لە تووک و دەنووک و
لە ئاواز و نەوا خۆم ئاسا کەوتبن



باڵایان شلک و تەشی بێ
وەک ئەوەی سووری منداڵێتی خۆیان
قەت نەدیبێ
دەنووکیان لە تووکی ئاسکی شاخ چوو بن
وەک شیعر مەزن و گەورە دڵ
لە تلیانی کەونا لە دایکی خۆ بووبن –
ناو سینەم درەختی پشکۆیە
گەردەنم داوەتە بەر بارانی شەمشێری تاڵی
بادیلی ساتێ بم
ڕۆژگاریش لە ڕاستیا ملکەچ بێ
ئەسپی کۆچێ گیانی نەوازش دەکرد و
کە پێم وت
گفتوگۆی نێوانمان
بایە وەک خوریلە لە دەستی دەپێچین
وەرزێکی نادیارە
کوا ڕووگە نەمایێ لەم هەرێمە نییە
بزانێ سیمرغی داهێنان لە کوێیە
ئەگینا ئەوەندەی تەنهایی میلی خۆی دەبینی
خۆی دەکوشت
– ڕۆژێکیان ئاسکی نێو کێوێ لایەکی کەل بووبوو
مرواری چاوێکی ڕژا بوو
ماندووبوون کەلبەی خۆی لە لولاقیا نابوو
مەمکوژە... مەمکوژە
بەرلەوەی کە ڕاوچی تیری خۆی لە کەوان ڕەتێنێ
بەپرشنگی چاوی دڵ و جەرگی ڕاوچی داخورپان
دوو دەستی پێ شل کرد

ئاوری ئەوینێ چاوی ڕاوچی ماندووی پڕ کل کرد
ئێستاکە من خۆشم دۆزیەوە
ئەو ئاسکە دەق منم
کێ دەزانی چەند کێوی تژ و ڕەوەزم بڕیوە
ناو دڵی چەند خەرەندی قووڵم
بەو پێیە وردانەم دڕیوە
کێ دەزانێ کوندەی ئەو دڵە کۆچەرییەم
ئاوی چەند کارێز و زەنوێری نۆشیوە
چەند باران و بەفرم ڕەتاند و
تەرمی چەند هەوێردەم لە ڕەنۆ بینیوە
کەوڵی چەند هەزار دارستانم بەلەشم داداوە
گوێکانم لە سەدەی چەنەدا دادەخەم
مەمکوژە... مەمکوژە
یەخدانی کۆنینەی کەوڵە جوانەکانت بکەوە
بزانە ڕۆحمی تیایە
زۆر خەناوکەی مۆری ئێسقانی ئەو لەشەم
لە شاخی کەڵەکێوی ئەوبەر گیربووە
زنجیرەی بیناییم پساوە و
تاوی زۆر ڕاوچییان لە چاوم پیر بووە!

١٩٨٦

هەندێ جار زمان لە ئاست توولانەوە و ئەستەمی ڕووداوەکاندا دەوەستێ و کورت دێنێ، هێزە پڕ گوڕ و بڕستەکەی ئەو بوونەوەرە زیندوو نادیارە ناپەرژێتە سەر کاکڵی مەبەستەکانی نووسەر، ئەمەیشیان دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەکی نەبینراو کە هەر هەموویان لە کاریگەرێتی بابەتەکەدا سەقامگیر دەبن و پارسەنگی نێوان زمان و ڕووداوەکە لەنگ دەبێ و لە تای ڕووداوەکەدا دەفرەکە لار دەبێتەوە... زمان فرە گرینگە بەتایبەتی لە بابەتێکی وادا زێتر داستان و ئەفسانە دەگرێتەوە، چونکە زێتر لە بەشەکانی دیکە گەرموگوڕی هەرا و زەنا و ڕووبەڕووبوونەوەی تێدایە، لەم شێوازە نووسینەشدا هەستم بەم ڕاستییە کردووە، هەوڵی ئەوەشم داوە لەگەڵیا هەڵسووڕێم، جڵەوی بابەتەکە بدەمە دەست زمان و بۆچوونی خوێنەر، هێڤیدارم لە ئاستی ئەو بۆچوونەدا بم.



(دەگێڕنەوە پاشایێ
سێ زەری هەبوو تۆران
لە زیندانی تەماوی مینای کۆشک و سەرایێ
زەری یەکەم ئاگر بوو، بەربووە گیانی کێوان
ئێستاش سەرت هەڵبڕە تروسکەی هەروا ماوە
زەری دووەم باران بوو، تا ئێستاش هەر دەبارێ
سروشتی بۆ چەماوە...
زەری سێهەم ئەڤین بوو
لە گەنجینەی دونیادا تەنها نەمری بۆ ماوە
لەم چاخە هەڵوەدایە
بۆ ئەشق هەر والآیە.)

**گۆیەندەی یەکەم:**

باران بەردی کەنارەکانی گڕ دابوو
ئاسمان جێ جێ سپی وەکو بەفری لوتکە
جێ جێش سایەقەی ساماڵ بوو
پۆل پۆل مەل و قاز و قولینگ
دەهاتن و ڕادەبردن.
گڕ و بروسکەی شاخەکان جارجار هەڵدەگیرسانەوە و
جارجاریش وەکو شکۆ بوون
لەژێر خۆڵەمێشی شەودا
دوا تروسکەی خۆیان دەهاوێشت دەمردن
لە سروشتی شاراوەدا
هەندێ ڕەواڵەت ئاوا دەبوون، دەتوانەوە
هەندێکی تر چل چرای بوونیان پێ دەکرد
دوگارکێ لەگەڵ ئەزەللا دەلوانەوە...

**گۆیەندەی دووەم:**

ئەسپی کەحێڵ بژی خۆیان
لە تیشکی زێڕ کفتی خۆرا نەرم دەکرد
سیمرغی شیعری دێرینەش
لانەی لەنێو خۆڵەمێشیا گەرم دەکرد
لە دیمەنێکی ئاوادا دەگێڕنەوە
چرا تیشکی خۆی دەکردە
میوانی نێوان دوو سینەی کلێپەداران
سواری پشتی باران دەبوون
لەبەر چاوی من و تۆدا ڕێ کپ دەبوو
هەتا ئێستاش کەس نازانێ کە ون دەبوون
لە کوێ خۆیان دەشاردەوە و، بۆ کوێ دەچوون،
کاتێ وەدیاریش دەکەوتن
فرمێسک بوون، لە دیدی مرۆڤ بەردەبوون،
ئێوە لە کوێن ئەی پەرییەکان؟

**گۆیەندەی یەکەم:**

وا چەم هەڵسا
با بیرەوەری بردم و بیابانیش ساردی کردەوە
چوومە نێو ئەو قەڵایانەی
شوێنە برینی مێژووی دێرینیان پێوە بوو
ئەوەندە تێکەڵ بەکپی ئەو ڕێیە بووم
تا بیرم چوو
مەست بەبوونی جەستەم بکەم
چی بوو ئاوا بەڕووباری ڕابردوودا
تێپەڕی و نەگەڕایەوە
ڕەوێ مەل دێن بەسەر کون و کەلەبەری





ئەم قەڵایانە تێپەڕن
هەور دەگرن، ئاسمانی زیو
لە گریانا دەبەستنەوە

**گۆیەندەی دووەم:**

چەمیش هەڵسا ئەی زەریەکان
هێشتا ماوە بەسەر دڵم ڕاببورێ و نەبڕێتەوە
ئەسپەکان یەک یەک وا دەمرن
وای کە ئەسپێ لە بێن دەچێ
من چۆن گرم تێ بەردەبێ
وای کە ئەسپێ دەحیلێنێ
خوێنم چەند گەش دەبێتەوە
خەڵکی ولاتی ئەسپەکان بوو
دەیگوت:
(من بۆنی یاڵ و بژی ئەسپەکان دەکەم و جەوان دەبمەوە)
ئێستاکە بۆ کە دەمبینی
لەڕ و لاواز و غەریبم
لەم هەوارە دڵم دەکەوێتە نێو گڕی گرانەتایێ
من ئەگەر دەست بەنێوچەوانی ئەسپەکان دانەهێنم
زوو دەمرم و دەتوێمەوە
لە هیچ شوێنێ سەبرم نایێ!

**گۆیەندەی یەکەم:**

وا چەم هەڵسا و ناگەمەوە ولاتی ئەسپە مەزنەکان
ئەوەندە تێکەڵ بەدونیای
حیلە و پرمە و نێسکە بوویمە
دەڵێی هەرچی هەیە و نییە ئاوا بووە
ئەی مەلەکان وەرن دڵم بدەنەوە

کە لە رووبار پەڕیمەوە
تەرمی پیرۆزی ئەسپێکم بینی
هێشتا چاوی هەر سەوز بوو
ڕەنگی خۆی نەدۆڕاندبوو
چەرمی گەردنی خۆی بەرنەدابوو

**گۆیەندەی دووەم:**

دەیگوت:
(بەدرێژایی تەمەنی خۆم نەگریاوم
بەڵام دەروونم تێکەڵی تەنهاییێکی ئەفسانە بوو
دیاربوو کەوا قوڵپم دەدا،
من لە هۆزی ئەسپی کەحێل و سورخنی وڵاتێکم
خووم بەزینەوە گرتووە)
وا چەمیش هەڵسا ناتوانم ئەی زەرییەکان بپەڕمەوە
جارێکی تریش بۆ ئەوبەر
خۆم بەتەکانێ بگرم و هەڵدەمەوە.
هێشتا ماوە بەسەر دڵم ڕاببورێ
دەستم لە هەموو شت بەربێ و
هەردوو چاویشم تاری بێ

**دەنگێ لە دوور:**

چۆن دەتوانن کڵپەی دڵتان
لە چاوی من بشارنەوە
چۆن دەتوانن بەری باران لەخۆ بگرن
چۆن دەتوانن لە هەر کاتێ گەرەکتان بێ
لە گۆڕی کەون دەرکەون
لە هەر کاتێ بتانەوێ ئەوسا بمرن





**زەرییەکان**

کۆت و پێوەندە برسییەکان
دەزانن چیتان مەبەستە
هەردوو دەرگاش پێ دەزانین
ئەمەیان دەرگای مردنە... بەڵام نەمری لەدوایە
ئەمیشیان دەرگای ژیانە... بەڵام هەر مردنی تیایە
ئێمە کلیلمان لە دەستە
هەر چۆن چاوتان هەڵتەکێن
دەزانین چیتان مەبەستە.

**زەری**(*) **یەکەم:**

(ڕوو لە دەنگە دوورەکە دەکات)
ئێمە دوو چەپک دەچنین
چەپکێ خونچەی ژێر سەهۆڵە و
خەنجەری بەر پشتی منە
چەپکێ گوڵە حاجیلەی ئەو کێوانەیە
لە سوخمەی بەرپێیەکانی دەدەم
لە نێوان پانوپۆی ئەم دوو دەرگا و دوو پەنجەرە
دونیا دوو لوتکەی گەوهەرە
ئەو بەرەی تۆ شیعری جوانی بۆ دەنووسی
من بەکوڵترین گریانی هەڵدەرژمێ
بەچاوانی تەڕ دێمەوە، خوێنی دڵمی بۆ دەڕێژم
ئەو بەرەی تر کە تۆ شینی بۆ دەگێڕی
من دەمەوێ
قووڵترین ئاوازی کەونی بۆ بنێژم.

(*) زەری: پەری کچ

**گۆیەندەی دووەم:**

دەمزانی چ ئەشقێ
نەخشەی مەرگی بۆ ئەو دادەڕشت
ئێواران کپ دەبوو لە لوتکەی دەڕوانی
شەوانەش دەگریا و ئاوارەی ڕێ دەبوو
قەفەسی سینەی خۆی دەکردە هێلانەی گریان
فرمێسکی بۆ زەوی هەڵدەڕشت
ئاگری یادی خۆ خۆش دەکرد
وەک بلێیی لە ژەهری برینی خۆی دەکوشت
ڕێیی بۆ دوور خۆش دەکرد.

**گۆیەندەی یەکەم:**

هەروا بووم
برینی کۆنینەی ساو دەدا و سەری پێ هەڵدەگرت
ئەوینێک لە ناخیا دەسووتا
درەخت و ترۆپک لە ئاستیا دەچەمان
دەگریا و بارانیش تێکەڵی ئەو دەبوو
ئەوساتە ئاسمانیش لە داخی سمۆرەی ئەستێران
دەخیلی شەو دەبوو.

**دەنگێ لە دوور:**

بەتەکما ڕادەبورد
پێم دەگوت: (تۆ خەمت
کەپکە شاخێکی یەکجار سەختە
لەژێریا چۆن ماوی و نەمردی
پشکۆی کام درەختە بەگیانتا نووساوە؟
بۆنی خاکی دوای کام بارانە
دیلی دەستی ئەو یادە پڕ ئاخەی کردی!





**گۆیەندەی دووەم:**

منیش بم چاوت قەت وشک نابێتەوە
تا هەتا دەڕوانمە لای بنار و کێوان...
بەڵکو دەرکەوتنی ئازیزێ
بزەی گەش بخاتە سەر لێوان!
(لەبەرە خۆ دەکەوێتە خەیاڵی سوارەی ئەشق)
بەهێزی وەکو تۆم کەم دیوە
تیرێکت بەهەناو کەوتووە
ئەوەی کە بەر لە تۆ
سینەی بۆ دەبانی ڕاموسان واڵا کرد
لەمێژە مردووە
ئەوینی بۆتە قامیشەڵانی سەوز و
لەسەر گۆڕەکەیا ورشەی دێ و شین بووە

**دەنگێ لە دوور:**

من دەزانم گوڵاوتان خوێناوی دڵە
ئەشقتان تەنها لە بری پێکەوەبوونی ژێر گڵە
من دەزانم جۆلانەیەک هەڵدەبەستن...
جێی دوو گیانی تیا ببێتەوە.
ئەوەندە بۆ یەک دەناڵن نەبێتەوە
ئێوەش فرمێسک دەڕێژن
وەکو من و گراوی خۆم
بۆ یەکتری چیرۆکی بەیەکگەیشتن دەبێژن
بەڵام ئەوەی لای من یەکجار شاراوەیە
ساڵەهایە لەنێو دڵمدا حەسرەتە
بەشی ئێوە هەر ون بوون و هەر خەفەتە
کەی ئەو دڵە پڕ شوڕەتان دادەکەوێ

کەی چرپەتان
گوێچکەی یەکدی جێ دەهێڵێ و
لە هێلانەی نێو زمانتانا دەخەوێ...

**زەری یەکەم:**

دیوتانە ئاگر داگیرسێ
دڵی سووتووی نێو هەناوی بداتەوە
دیوتانە باران بباریێ گوڵەگەنمی خۆی ببینێ
یا هەور لە نیوەی ڕێدا
بروسکی خۆی بباتەوە
ئێمە بۆ ئەو داگیرساین
هەتا هەتا بلێسەمان هەر بەگوڕ بێ
ئێمە بۆ ئەوە دارڕژاین
هەتا هەتا ڕووباری ناخمان لە خوڕ بێ

**دەنگێ لە دوور:**

بەڵام هەرچی گڕ و کڵپە و ژیلەمۆیە
لە ئەدگاری ڕووبارێکدا دەکوژێتەوە
هەرچی هەوری ئاسمان هەیە
لە بارانێکی پەڵەدا دەتوێتەوە
هەرچی شەوە خۆرێکی بەدوا دێتەوە
زستان بارانێ دەهێنێ و دەکشێتەوە
شەمی شەوانی ئاشقان
دادەگیرسێ و دەتوێتەوە
بەڵام ئێوە لە کام سەرەتای هەڵچوون و
لە کام کۆتایی دەچنەوە.





**سوارەی ئەشق:**

لەو بەرەوە ئەگەر توانیت
سەرەتا بۆ گوڵ دارێژیت
ئەگەر توانیت نهێنی شەپۆل هەڵێنی
بەزمانی مەل دەزانی
ئەگەر توانیت لە سەرەتای بوونت بگەی
ئەمڕۆش نەبی سبەی دەگەی.

**زەری سێهەم:**

ئەوەی لە خوێنمدا
پشکۆی سوور دەچێتەوە
بۆ بەر مینای پەنجەرەی
سوار ئەسپێکی خەمگینە
دڵمی وەک چۆلەکە لە لانە دەرهێناوە
ئەو حەسرەتەی دەیچێژم
بالۆرەی دایکەکانە لە سەردەمی مناڵی
ئەو هەناسە ساردانەی
ئاسمانی پێ ڕەنگ دەکەم
ئەو گریانە بەکوڵەی سینەمی لێ تەنگ دەکەم
دونیا هەڵدەپڕوکێنێ
ئەو گۆرانییەی من دەیڵێم
چاوی بێشکە و ساوایان وردە وردە هەڵدەتروکێنێ.

**سوارەی ئەشق:**

من لێرەوم ئەزیزم
کەوتوومە پشتی کێوان...
لە داخ دەوری و ئەڤینی
(خەمی چەمی چەتەڵی)
ڕەنگی بەفری کوێستانم پەڕیوەتە هەردوو لێوان

(فەرخێکم) دەناڵێنم
(ستیم) پەرەنگی خوێنە
هەرچەند بۆ لات ڕێ دەبڕم
ڕێ هەروەک بەردە ئاشە تۆ لە کام کێوی قافی؟
ئێستاکە ئەو دڵەی من مۆڵکی هەردوو چاوتە
چونکە تۆ بووی ئەوینت گەورەتر دی لە پاشا

**زەری سێهەم:**

تۆلاز بووم لەبەرت دانیشتم
پرچم وەک مشتێ گەڵای تەڕ
خۆری لەسەر دەخوساوە
هەنیەم ئاوێنەی ڕژاوی بەرکانی بوو
ڕۆحم تازە دەبریقاوە
ڕوومەتم هێشتا هەر ساف بوو
چرای بەژنم بۆ دیدەنیت گڕی دەگرت و هەڵدەچوو
مەرجانی چاوی پڕ کلم بۆ دەڕشتی
بم زانیایە هەست بەدووری ئاسمان دەکەی
دێوی کەونم بۆ دەکوشتی.

**سوارەی ئەشق:**

لەپم دار ماڵی زەنگیانەی ئاسۆی دوور بوو
ئەوێستاکەش لەڕ و لاواز و کەنەفتم
وا ریشم لە زەوی دەخشێ
من نازانم تۆ نە دەنکە یاقووتێکی زۆر بچووکی
نە من عومرم بەرەو ترۆپک هەڵدەکشێ
ئەوێستاکەش پشتم بۆتە
گۆمەزەی سەر گۆڕی سینەم
خوێنم لەسەرخۆ لێ دەدا





دڵم دەڵێی ڕووبارێکی بەربەستدارە
زۆر کەم ڕێ بەهەناسەم دەدا.

**زەری سێهەم:**

بۆ تۆ دەگریم بیرم نایە سپێدەیەک
تەبەشم بەئەشکی چاوان پڕ خوناوە نەکردبێ
بیرم نایە هێڵابم زستانێ بڕوا
ڕێبەندان لە سینەی مندا نەمردبێ.

**سوارەی ئەشق:**

لە بیرمە تازە گزنگ
لەبەر سواندانی ڕادەخوند
کە هەستامەوە دوو کۆتری سپی سپی
لە دەوروبەرتەوە دەگمان
ئاوریان لە خوێن بەردەدا و
ستونی کەونیان دەڕمان
تۆش لەپت بۆ دەکردنەوە
بازیان دەدایە سەر شانت
زمانیان نەبوو
گویم لێ بوو بۆت دەدوان
هەر لەو ڕۆژەوەی هەڵفڕین
تۆ کەوتیە نێو فاقی ڕاوان
زمانت شکا لە عەزرەت هەردوو چاوان
وەکو چەمێ کۆچی مەلانی لەسەر بێ
ئاوا تاسام
ئەوێستاکەش چۆنت لە هامێز هەڵێنم
بەپشتی هەروەکو لوتکە و
بەباڵای کەوانە ئاسام.

**زەری سێهەم:**

هەر سپیپاتێ لە شاخان بەردەست و چاوم بکەوێ
هەڵی دەگرم
دەڵێم خێرا و دەچمەوە کۆتم بۆ نسکۆ هێناوە
دەیخەمە نێو ئەشکەوتی باخەڵی تەنگم
کە دێمەوە بەفر هەمووی دەتوێتەوە
لوتکەکان خاڵ خاڵ دەبن و
شاخەکانیش ڕەش دەچنەوە
چۆن دەتوانم جارێکی تر
زمانت بۆ بکەن بەلانە
تۆلاز بووم لەبەرت دانیشتم
وا پیریش سەری سووتاندم ئەی تاقانە.

**زەری دووەم:**

ئەو ئاگرانە دەبینی لە لوتکەوە دیارن
ئاگری دەستە خوشک و ئەزیزانی دڵم بوون
درەختەکانت دیوە
سەر بۆ فەلەک کێشراون
باڵای جگەرگۆشەمن...
بەزیندوویی نێژراون

**زەری سێهەم:**

لە کوێی ئەی ئەسپی سوورخن و
لولاق خەنەیی و خاڵ خاڵ
من کاتێک (کۆشک)م بینی
بۆتە بەربەست و دیوار
کە هەنیەی ڕووی تۆم بینی
تۆ ئەو دەستە ڕەنگینەی





توانیت بەئاهی سارد و بەتەنها یەک نیگا بێ
چی قەراڵ و پاسدارە
هەموویان هەڵتەکێنی
لە زیندانی پاشایی سەرزەمین دەرم بێنی.

**دەنگێ لە دوور:**

گوێم لە گفتوگۆتانە
چرا دادەبیسێنێ
ئاگری قسەتان پێکەن
بەڵکو پیری یەکجاری سەرم دادەگیرسێنێ

**سوارەی ئەشق:**

بسک ڕەشی کۆشکێ بووی
دەست و پێوەندت زۆر بوون
بازووی نەرمی کەنیشکان
نەرمە بالیفی نازبوو
تۆ شا کچی خەونێ بووی
لە زێڕ و زیوی دونیا
لە گەوهەر هەڵکێشرا بوو:
بەڵام دیارە ئەڤینی نیگایێ دایگیرسێنێ
هەرچی ماڵ و سەروەتە
لە چرکێ دەیبەزێنێ
ئەوێستاکەش ئاوارە
دارستان تەی دەکەی
دامێن و قەدان دەبڕی
دەرکراوی لەو شارە
چۆن بەفری خەمەکانم
بەسەر شان هەڵتەکێنم

چ شەرابێ مەستم کا تا من هەڵیقورێنم
نە درەختێ دەبینم نە ڕەوە مەلێ دیارە
زەمین سەرسام بێ دەنگە
دەزانم کە تۆ نەبیت ئەم دونیایە چەند تەنگە...

**زەری سێهەم:**

تۆ بجولێ و دامێنان لە پێلاوت بدورە
لوتکەکان گڕدە و وەرە
لە کانیەکان بپرسە منت بۆ نیشان دەکەن
ئاوی کانی نەماوە من بسکمی تیا نەشۆم
لە درەختان بپرسە منت پێ پیشان دەدەن
خۆ درەختێ نەماوە من خوێنمی تیا نەخۆم
لە نسێی زۆر ئەشکەوتا
فرمێسکم هەڵڕژتووە
لە ڕەزی زۆر بنارا
عەتری تۆم هەڵمشتووە
تۆ بجولێ و درووێنەی ڕێگە و بان و شاخ بکە
دیدت فێرە فرمێسکی سەد خەفەت و داخ بکە

**سوارەی ئەشق:**

گەلێ ڕێگەم بڕیوە. ئەشکەوتم گەلێ دیوە
دڕندەی زۆر جەنگەڵان
دالّی پڕ مەیلی خۆیان لە گۆشتم گیر کردووە
کچی زۆر گوند و دێیان
خەمیان لە من پیر کردووە
لەوەتەی هەم بەڕێوەم
کەی ڕێی درێژم بڕیبێ
هەر ئەو کاتە زانیومە





من هێشتا کە لە جێوەم
بۆ ئەوەی بتگەمێ
دەبێ کراسی ئاڵەکۆک
لەبەر گیانی بەفرکەم
دەبێ شەڕابی ژەهراو
لە مارەیی دەفرکەم

**زەری سێهەم:**

من دەتوانم ئاشقی لایەق بەدڵی تۆبە
لەگەڵ لایلایەی دایکت
تۆ فێرە ئەڤینی بووی
لەگەڵ دەسرازەی لانک
لە ئازادی گەییوی
بەڵام گیانە ئەزیزم، منیش کە بەتۆ پێکرام
سەرتاپا نووری ئەشقم لە ناخدا هەڵقولاوە
نەمانی زۆر ئاواتم
لەنێو دڵا چەماوە...

**دەنگێ لە دوور:**

ئەگەر دووری یا نزیک
دەبێ زۆر چاک بزانی
تۆ ئێستێکە تەڵەزمی یەک پارچە ئاگری ئەشقی
ئەگەر ماوی یا مردووی
لە سووتانی ئەویندا
جۆخینێکی گڕگرتووی

**سوارەی ئەشق:**

سیمرغێ لە کوێ بێنم
گوێت لە ناڵەی ئەسپم بێ
چۆن ئاگری من دەخوا
بارانی فرمێسکی من
کەونی ئەم خوایە دەشوا...

**زەری سێهەم:**

کە بەهار هات ویستم بەرگی گیا لەبەر کەم
تا تێکەڵ زەوی ببمەوە
ویستم دەست لە ملی ڕووبار کەم
بۆ گۆڕی ئەوبەر بچمەوە
کە بەهار هات
ویستم لە زمانی درەخت بگەم
لە سەوزایی گەڵا بمرم
ویستم دەست لە ملی با کەم
تا لە تەکیا ئۆقرە بگرم
بەڵام نە گیا سارێژی برینی کردم
نە ڕووبار و درەختیش دڵیان دامەوە
نە پەیتونی بای کێوەکان هەڵیگرتم

**سوارەی ئەشق:**

(بەهەناسە ساردییەوە)
من هاتم لە دووڕیانێ یەکتر بگرین
ئاژەڵی ڕێی پێ ون کردم
ڕەشەبایێ ڕێی لێ گرتم
ڕەنگە سەدان ڕێم بڕیبێ





کەوشەن نەمابێ تەی نەکەم
هەزار برینم بۆ لەشی خۆم کڕیبێ
بەڵام دیارە قاچم لە زەوی چەقیوە
بۆیە خۆم هەر لەو هەوارەدا دیوە

**زەری سێهەم:**

کە هاوین هات خۆم دەخیلی ڕێیەکان کرد
شوێن پێی تۆم بۆ بدۆزنەوە
یا هەر نەبێ
سەدای هەڵفڕینی مەلێ
لە بینینی مرۆڤێکدا بقۆزنەوە
کە هاوین هات
بوومە هاوەڵی ساماڵان
بەڵکو لە ئاوێنەی زیویان
بەسێبەرت شادم بکەن
بەڵام نە دەمی ڕێ گەڕا و
نە دامێنیش لول بوونەوە
نە ساماڵیش لە نزای من قووڵ بوونەوە

**دەنگێ لە دوور:**

ئێوە زمانتان هی پەری ئەفسانەیە
مێژووی خۆڵەمێشی خۆتان
بەبلێسە دەنووسنەوە
ئێوە سیماتان سێبەری نادیاری تەم و تاوە
ئەم دونیایەش هەمووی قەسەری سووتاوی
ژێر تیشکی گەرمی هەتاوە
من برینم بەئەوینتان دەکولێتەوە
دەبم بەلیسی کۆتری خەمەکان و

هەزار داستانی خەمگینم
لە ناخەوە دەتوێتەوە

**سوارەی ئەشق:**

ئێستێکە نوتەکە و چاو چاوان نابینێ
ڕێی دوور و تەمی سپی
ئەوینی و خەمی ڕەش
ئەوەها تێکەڵی یەک بوونە
لەگەڵ ئەم یاسایە
دەڵێی هەرچی بوونە
لە ماتەم ڕووچوونە...

**زەری یەکەم:**

لەو ڕۆژەوە کە دایکم دوا هەناسەی هەڵکێشا
دەرگای زیندان گڕی گرت
پاشا ژەنگی هەڵێنا
منی لە پێستی بوونی ئادەمیما دەرهێنا
پیشەم بلێسە و گڕە تا دونیا ڕوون کەمەوە
تا نووری لەشم مابێ
ڕێی هەزاران سوارەی تر
لە کێواندا گوم نابێ...

**دەنگێ لە دوور:**

ئەی بریندارى مێژوو
ئەو نوورانەی هەڵدەچێ
بۆ بەرزی تۆ نیشانە
ئەو شینەی تۆ دەیگێڕی
شینی هەموو ئینسانە





**زەری سێهەم:**

کە پاییز هات قژی خۆم لە گەڵایان بەستەوە
بۆ ئەوەی لە کاتی وەرین
بەنهێنی کۆتایی بوونەوەران بزانم
سیسی کردە هاوەڵم
ئەوینمان تێکەڵ بێ
بوومە هاوڕێی مەلەکان
تا لەگەڵ کۆچیانا بێم
بەڵام نە گەڵا توانی نەهەنگی دڵم بکوژێ
نە سیسی درەختەکان لە زمانی من گەیشت
نە ئەو مەلەی کۆچ کردووش
توانەوەم هەڵمژێ.

**زەری دووەم:**

(هەر لەو ڕۆژەوەی پاشا
فەرمانی دایە نێو ماڵ
قژی کچەکان ببڕن)
ڕەنگیان لە کۆشک بسڕن
من لە (ماڵێ دەرکرام)
بووم بەبارانی گوڵاو
دونیا تەڕ دەکەمەوە
جۆش دەکەم تیشکی هەتاو
ئەو دەشتاییەی نێوانتان
دەکەن بەپردی خوناو

**پەری یەکەم:**

من بەنێڵەی ئاگرم بێشەڵانێ دەسازم
بەفری ڕێتان قاو دەدەم
چەقۆی ڕق و قینی خۆم
کە دڕکی چووە نێوان
گیزانی گڕم دێنم بۆ هەناویان تاو دەدەم

**سوارەی ئەشق:**

چاوەڕوانی ئەو ڕۆژم خۆری بازوێک هەڵێ
شەوەزەنگان گاڵ بدا
بەرلەوەی بەفری زستان
کۆتایی بەمن بێنێ
ڕێگای دوورم دەرکەوێ
خوێنی تاسە و غەریبیم
سەرلەنوێ سەرکەوێ

**زەری سێهەم:**

وا زستانیش ڕابرا
پەنام بردە بەر ڕەنوی
شاخێکی دوور لە چرا...
بەڵکو سەرم داپۆشێ و ئاگری دڵ وەکوژێنێ
سواری پشتی شەختە بووم
بۆ لای تۆم بخزێنێ...
ئاگری ئەو دڵەی من وا ڕەنۆشی تواندەوە
نە شەختە ما و نە بەفری ئەو ترۆپکە دوورانە...
هەرچی من دەستم بۆ برد...
لە نیوەی ڕێگەدا مرد.





**سوارەی ئەشق:**

زۆر دەترسم بەرلەوەی بگەمەوە شلێوە
برینی کۆنینەی لەشم
دیسان بەبن دەنەوە
ڕابردووی تاسە و ئاوات
پەنجەرەی خەمی کۆنم لەنێو دڵ بکەنەوە
دەترسم مەلێ نەبێ بەسەر تەرمم ڕابورێ
لاوک بێژێ نەزانێ بالۆران بنێرێتەوە
(دەنگی هەڵدەبڕێ...
ئەگەر بایەکی بەڵێنی دەبزێوێ
دەدا لە خەزەری پاییزان
گەڵای دار دەڕوا بۆ بڵندان
باز فڕین... چوون بۆ تراغان
لێک کوژانەوە مەشخەڵ و چرا)

**زەری سێهەم:**

لە کوێی فرمێسکی چاوم
ئەم بوونە دڕندەیە
دەستی لە هەوکم ناوە
گەر ئاگری دڵم نەبێ
لەمێژە گیان فەوتاوە
هەردوو دەستی سڕ دەبن، لەبەر خۆوە دەڵێ:
(حەنایی کردووە پەنجەی بەخوێناوی دڵم زارم
ئەمە ڕەنگی شەهادەت بێ کە کوشتەی دەستی...)

**سوارەی ئەشق:**

(خەمێکی قووڵ دایدەگرێ و دڵی خۆی دەداتەوە)

بەسەر دوندی دوور و بەرزی بەرئاوایی شەو دەوەستم
دەزوی سەیرم دەدەمە بەر قوشی هزرم
چاو لە چیا دەدورمەوە
گوێ لە زەمزەمەی ئاوێتە
خاک و دار کاژان ڕادەگرم
لە ئەندۆی ئەو ئاگرانەی
لە قەد و لوتکە و ترۆپکان سەما دەکەن
کە شوانەکانی ڕەوەندان
لەناو کێڵگە ئەنواکاندا دەیکەنەوە
لە ناخەوە لەم زیندانەی خۆم ئەشکی خوێن
هەڵدەڕێژم... دەگریم دەگریم
کاشکێ منیش دەمتوانی تۆم لەگەڵ بیت
لەگەڵ قسەی سادە و خۆشی ئەوان بژیم

**زەری سێهەم:**

(وەک بڵێی گوێی لە کروزانەوەی ئەو بێ)

وەکو ئەوان جگەرەیەکی زۆر بچووک
ئەم دونیایە گەورە و بۆرەم لەبیر بەرێ
کاشکێ منیش وەکو ئەوان
دەمتوانی گورگی شاخان لە خۆم ڕادەم
سەرم بەبەردێ بکەم و ئاسمانی شین
هەندێ جاریش هەور و هێر و ڕەهێڵەی زۆر
یا هەر نەبێ کەڕکولوا
یا ئەشقی تۆ بەخۆم دادەم.



**سوارەی ئەشق:**

(زۆر کەشەنگە)

ئەی گریانی خۆشەویستی
ئەی ئیشقی قووڵ
کاشکێ منیش دەمتوانی
وەک خەڵکی چەم و چیایێ
لە پەشت پەرژینی ڕەزی کاڵ و کەپکە شاخێ
بۆ ژوانت بێمە ڕایێ...

**دەنگێ لە دوور:**

ئەمیشیان گوێی لەم دیالۆگە دەبێ و لە
ناخەوە دەکوژرێ و دەڵێ:
(بەلەیلاوە وەرە بەر قاپی ئەم لەیلایە ئەی مەجنون
شەهێکە سەد سەری فەرهاد و شیرینی لەبەر پێ کەوت)

**سوارەی ئەشق:**

(تارمایی هەردوولا تێکەڵ بەیەک دەبێ و بەردەوام دەبن):

بەرلەوەی برینی ئەو دڵەی ئەوینت کون کونی کردووە
لەژێر نۆتەی وشەی سەخت و تووش
لە سونگەی جۆگەلە و کەناری چۆڵ و هۆڵ مردووە
تێکەڵی شەمشێر و چەقۆ کەم
بچمەوە گەڕەکی خاک و خۆڵ
بەرلەوەی هەنگوێنی بالۆرەی شێتی خۆم
تێکەڵی ژەهراوی ئەزەل کەم
بەرلەوەی چرای پەنجەی زام و لاوازم
بگێرم بەناو پرچی هەورت
بەرلەوەی بمرم و بۆ دڵێ گەورەتر





بۆ ساتێ کرێشمەی بارانی نەمێنم...
دەمەوێ ئەو چەمە خوڕەی دێ
بەشاخ و دۆڵەوە
بەکاژ و لاولاوە و مێرگەوە هەڵگرم
بیخەمە کیسەیێ لە پەراسوی تەن و چاومی حەشاردەم
تا ئەبەد خوڕەی بێ لە تەلانی تژ و دامێنم

**زەری سێهەم:**

ئێواران جارجارە هەڵۆی چاوی زیوت
بفڕێنە سەر داو داوە بسکی ئاسۆی دوور
کە چاوی لە گریان سوور دەبێ
وەن دەبێ لەودیوی تەمیانی نەیستان
بڕوانە دوا مەلی بولّیلان
گەرویان لە جریوە داغ دەبێ و
بەبێ دڵ دەچنەوە دارستان
بڕوانە دوا تاولی
کۆچەران
کە بارکۆڵەی خۆیان لول دەدەن
دەچنەوە زەنویر و ترۆپکی خەمگینی.
هەر شوێنێ بارانی لێ دابێ و
هەور سێبەری خۆی دابێتێ
لەو جێیە دووچاری خەم ڕەنگ و
شەق شەقی دڵی من دەبینێ... (دەکەوێ)

**سوارەی ئەشق:**

(تەواو هیلاک دەبێ)...
بەرلەوەی چیدیکە
لە ڕەز و سەر کانی و گوێ بیرە ئاوی دێ





کەزی چاوی کەویی فەراقە کیژۆلان جێ بێڵم
بەرلەوەی لەبن کەپر و جۆخین
لە گەرمای خەرمانان
کۆتایی بەخوێنی هەڵچووی خۆم بهێنم
دەمەوێ ئەو گوندەی تۆی لێ بوو
بەچاڵی گەمەوە... بەلەودە و شەغرەوە
بەقرشە و دەولک و جەنجەڕ و بەفرەوە
بەو چەمەی مناڵی
منی بۆ شەوانی کەنەفتی بردەوە
بخەمە ناو تێرکی ئەوینم
دانێمە پەنجەی ئەو دڵەی کەزی تۆ سووتاندی و
درەختی هەزاران هیوای تیا مردووە...
(دەکەوێ)

**گۆیەندەی یەکەم:**

بایێکی وا هەڵی کرد
مەرگ و ئەشقی تێکەڵ کرد
زەریان دەنگیان بڕاوە
چرای داستانێ، گەورە
لەنێو شاخان کوژاوە
هەر ڕووبارێ ببینی، شەپۆل دەنگی ئەوانە
وەک بڵێی دەزریکێنن
خوێن لە برینی سەد ساڵەی
بیرەوەری دەهێنن
دەبنە فرمێسکی گەش و
دەڕژێنە دۆڵی مێژوو
خەم دەخەنە هەناوان

کلی حەسرەتێکی قووڵ
دەخەنە هەردوو چاوان...

**گۆیەندەی دووەم:**

بەفر دونیای داپۆشی
دێ بزر بوون لە چاوان
باڵا ئاشق چەماوە
ئێستاش بچۆرە ئەوبەر
درەختێ لە دوور دیارە
لە هەموو وەرزێ شینە و
گەڵای سەوز دەچێتەوە
دەڵێی کاروانی ئەشقە
لە هەندەران دێتەوە
بۆ هەر لایێ ئاوابیت
دەکەوێتە ڕێتەوە...



**خان**

بەتەک مینای پەنجەرەوە
سەیری
کاژ و چیای ئەکرد
دامێنی دووری ئەبینی
ئاگری هەتاوی بەیانی تێبەر ئەبوو
تەمیش سەری ترۆپکانی داگرتبوو
وردە وردە بەئاسمانی شار وەرئەبوو
بەپەنجەی نەرم و ژێ ئاسای
پرچی مناڵی باوەشی دائەهێنا
ئەیگوت ئێستاکێ دێتەوە
– کۆرپەم، ئەژنۆم، تاقانەی خۆم
بەو گریانەی خۆت مەمکوژە
جارێ لە باخەڵی گەرمم
شیری مەمکانم هەڵمژە
جارجار ئاخێ، مەلێکی دوور، کزەبایێ
یا شریخەی شکانەوەی
درەختێکی ماندوو لە ئەندۆی گەڵایێ
هەناسەییێکی زۆر نەرم و بەفرئاسای هەڵئەکێشا
هەردوو لێوی
لەنێو هەنیەی کۆرپەکەیا ڕەگ بەست ئەکرد
چاوی لە برینی هەناوی خۆی مەست ئەکرد
ئەو ئەیزانی بەفر لە کوێ دایکردووە
کێ کۆتەک شکێنی ڕێیە
– کۆرپەم، ئەژنۆم، کەسوکارم
ئەم نیوەڕۆیە دێتەوە

ڕەنگە کرۆسک و بادامی چیات بۆ بهێنێ
سەندوقی سەری زیندەگێن، تاج و بەختم
جارێ شیری ئەو مەمکانەی من هەڵمژە
دیسان تەکانێکی ئەدا
سەیری خەرەند و زناری دووری ئەکرد
گوێی بۆ زەنای
ڕێگەی هەزار سەر هەڵئەخست
بەفر و ئەتگوت ئەڵماسی قەیرێ شکاوە
هەتا چاوی ئەسپی کەحێلی کول ئەکرد
ئەیگوت ئێوارە دێتەوە
– چیت و بازە و سوسکەی کێوانمان بۆ دێنێ
کۆرپەم، ئەژنۆم، کۆنترین شەرابی مەستی
فرمێسکێکی گەشی لە چاوا ئەتەقی
هەر دوو بسکی بەرئەدایەوە سەردەستی
دووبارە ڕوو ئەنیشتەوە
تەمی مینای پەنجەرەکەی ئەسڕیەوە
بەنیگایەک تەنیا کومان و تەقەز بوو
هەموو دونیای بەرچاوی خۆم ئەکرپەوە
تەم و پەرشی سەرچنار و کاژی
ڕێ بووبوو
باشوکەی دوندە دوورەکان
چووبوونە تاقی ئاسمان
– ئەگەر ئێوارەش بێتەوە
ئەم مەلانە شایەدمن
بەیانی ئەگەڕێتەوە
کۆرپەم، ئەژنۆم،



پشت و پەنام
تەمی ئەم ئێوارە بۆنی چڵەی لێ دێ
هەورە دژە
با سامی چاوم نەتگرێ
شیری مەمکانم هەڵمژە
ڕوخساری نقومی فرمێسکی بەگوڕ بووبوو
هەر سەیری کێوانی ئەکرد
هەموو لوتکە و دامێن و ڕێن
– ئەوە مەلن وا کۆچ ئەکەن
چ ڕەوێکی ئەمەکدارە
هەموو ساڵێ بەبەر پەنجەرەی من دادێن
ئەوەش تاکە قولینگێکە
لە ڕەوەی خۆی بەجێ ماوە
بەتەنها ئەپەڕێتەوە
کۆرپەم، ئەژنۆم
سوێندم بەو کێلی زەمانە
بەو گومەزەی
سەدان بەردی نەزر و نیازی تیا پەنهانە
تۆ شیری مەمکم هەڵمژە
ڕێگەی ئێستا دارماڵی تۆف و زریانە
ئیدی پەردەی پەنجەرەکەی دادایەوە
هەموو شتێ
لە عومری ئەو کۆتایی هات
خۆیی و کۆرپەی هەموو کەسی
کەوتنەوە نێو ژوورێکی مات

## چل کەزی

(١)

تاوس خان کوڕی مەریەمە و لە قاوەی مەرگ دەپژێ
تاوس خان پەری تەمگرتەی جنۆکانە
بەهەموو شت خەنجەر لە سینەی ڕووناکا
زۆر کەڕەتان گومان لە سایەی چل کەزی
گەوهەرپژی ڕژاوی سەر شانی دەکا
لە ئێوارەی گوندی پەرییان خوولّقاوە
خەمگینی لە چاوی مەنگی سارە ئاسایی
کەڵەکێوی دوور هێناوە

(٢)

تاوس خان قەفتەی خەنجەری
شیرڕێژکراوی مەبەست بوو
لە ژەهری دڵێکا خەم ئامێز و مەست بوو
لە هەوری گومانا پەرچەمی دادێنا
لە ئاوێنەی کپی بارانا
سینە و مەمکی سرکی خۆی دەشوشت
لە چرای شەبەنگی ئێواران خۆی دەکوشت

(٣)

تاوس خان:
لە قووڵایی کانی غەیبستان پەیکەرم بۆ کردی
لە ڕەزی پەریان تۆی لالەم دزیبیەوە
دەرزی نەزرم پێ هەڵگرتی
پەزموردەی خوناو باری گیا و کارەسات
لە ون بوون پەنجەرەم



بۆ لە مینایی یۆنان سازکردی
– وردبەوە لە سیمای خەمڕەنگی ئەم سوارە
تویڵی تەختی شاژنێکی نەهەنگە

(٤)

تاوس خان؛
پەریستان خەونێکی بچووکە بێ دەرگا و پەنجەرە
نە دەریا دەروونی دەسمێ و نە تاقی بەرز و دوور
نە لوتکەی دیارە و نە تەمی سەر باڵای زراقی کۆساران
چراشێ سیناهی نابەخشێ
زەویشی بێ بەشە لە عەتری خەمکوژی دوای باران
ئەوەتا سەبەتەی گوڵ فرۆشەکانیش
لە بەردەم کلێسا نقومی تەمتومانن
لە شەبەنگی چاوی زێدی تۆ
گیرۆدەی دووپشکی گومانن

(٥)

ئوڤیلیام بەگەڵای سەوزی ژێر ئاوانم چواندی
لە درەختی هەزاران لقی بەر باران
سێوێکی نێو لەپی (حەوا) بووین
ئەفسانە تێکەڵی دەمی تیغی کردین
ئەوەتا ترازاین پێکەوەش هەر بەندین

(٦)

تاوس خان؛
ئێوارە چوومەوە ناو شاری پەریان
شاپەری تەویێڵی ماچ کردم
دەرزیبیان لە پێستی لەشم دا





چی نهێنی هەبوو لە ئەفسانەی خۆیان
هەمووی بۆ باس کردم
شەو ڕابورد و بەیانی هاتمەوە
وامزانی مەلی بەر بارانم
دەرزی لەش ترازا خەونێکی سەد ساڵ بوو
هاتمەوە سروشتی جارانم



## چاودێری

هەموو دەمەو ئێوارەیەک
وەکو گوڵەگەنمی تازە فەریک
خۆی دەخستە باوەشی ڕێیەکی تەریک
لە دوندێکی دوور ئاوایی بەتەنها خۆی دەبینیەوە
لەم ئاوەدانیە دابڕا و
لە کتێبی ژینی ئێستای خۆی دەبۆوە
لەگەڵ ڕابردووی خۆی دەژیا
بەیاد و ئازاری زۆری ڕۆژانی زوویدا چۆوە
زۆر کەرەتان هەتاوی لێ ئاوا دەبوو
دەخزایە نێو تاریکی کەڤر و درەختان
گازەرەی پشتی ڕوو دەچوو
لە زەنوێری خوناو پەخش و
کەپکەی نێو ڕاستایی و تەختان
هەندێ جاریش
هەڵدەدێرایە نێو جۆگەی
پڕ لە بەرد و زیخی بەرگۆم و کانیە ئاو
یا وادەبوو شان و پشتی دەکەوتنەبەر
لەنگێزە بارانی ناکاو
ئەوین و تاسەی لە هزری خۆیا دەچنی
دەکەوتە دوای کۆلاری عومری بابردوو
بەخۆ و شەمشێری دڵی دەکەوتە گیانی ڕابردوو
(ئەلێرە بوو یەکەم گراوی مانگ ئاسای خۆم ئەدۆزیەوە
ئەلێرە بوو یەکەم جار ئەو دڵەم سووتا و
نۆبەرەی خۆم بەخاک سپارد)
سۆی جگەرم لێ کەوتە ڕێ





دەشزانم هەر لێرەکانە
ئێسقانم ورد و خاش دەبێ و گیانیشم سارد هەڵدەگەڕێ
بیرم هاتەوە چەند هەور و مەلی ئەو ناوەم دەبینی
بەم کۆسارانە ڕەت دەبوون
چەند جاران کۆڕەومان گرتووە بۆ لوتکەی دوور
بەفرمان بەسەر باریوە
گوێی خۆمان قوڵاغ کردووە
بۆ لورەی کرمە بەفری سوور
هەر ئەوسا بوو پۆڕمان دەدیت
تازە باڵیان تووکی دابوو
پووشیان لەبەر مشاری دەنووکیان نابوو
(ئەلێرە بوو
گڕم لە فریزی حەسرەتی خۆم بەردەدا
یەکەم ئەوینم داگیرسا
هەر لێرەش بوو دوا گۆرانیی ماڵئاواییمان دەچڕی
ئیدی دەستمان لێک بەردەدا)
ڕاوی ئاسۆی دووری دەنا
لەولاشەوە تیلاکی لێ لار دەکرد و
ورد ورد دەهاتەوە نێو دێ
هەرچیەکی دەهاتە بەر
چیا چیا... تاوێر تاوێر و ڕێ بەڕێ
ڕابردووی ئەویان لە خۆدا دەشاردەوە
بۆ هەر یەکەشیان ڕای دەکرد
سەرابیان لە مشتی دەنا
دەست بەتاڵیان دەناردەوە
هەموو دەمەو ئێوارەیێک



سەری پڕ هزری هەڵدەگرت
گەرم و ڕووخۆش بەدڵی پڕ حەز و بریا
کە تاریکیش دادەبەزی و دەهاتەوە
هەناسە سارد و خەم زەدە
هەتا بەیانی دەگریا و
کەسیش لە دەرگای نەدەدا.

## دوا گۆرانی

هێندێ شتم لا کۆببوونەوە و دەروونیان هەڵدەتەکاندم، وازیان لێ نەدەهێنام و منیش وازم لێ نەدەهێنان، هێندێکیان ماسی ئاسا لە دەستم هەڵدەخزین و وەدوایان دەکەوتم، هێندێکیشیان وەکو ڕەوە کەروێشکێکی نامۆ و ڕام لە سینەما دەخولانەوە، نەمدەزانی چییان ناو نێم؟

کە هەڵپرژامە سەر کارەکە و بینیم ئەو جۆگەلانەی کە لە ڕووباری بێ سنووری نووسینەکە دەبنەوە گەورەترن لە لمی کەنارەوە، ئەو لق و لەتەرانەی کە لە قەدی درەختی بێ دەنگی وشەکانەوە بەرەو ئاسمان هەڵدەکشێن، جوانترن لە چڵەپۆپەی ڕەزەکان، هێندێ جار جلەوی قەڵەم لە دەست سەری پڕ لە ژانی مرۆڤ دەردەچێ و دەکەوێتە دەست ئەو خەیاڵە سەرکێش و ورد و بێ سنوورانەی لە دونیای ڕۆمانتیکیەتیان ڕەخساندووە، بۆیە نووسینەکەم تخوبی چەند کۆپلە شیعرێکی بەزاند و کەوتە قاوغێکی ترەوە، ئەگەر دیقەت بکەیت دەزانی چی دەڵێم، منیش هەمیشە ئەوانەم خۆش دەوێن کە شەمشێرەی سەلیقەیان لە تاوی خوێندنەوەدا لە کاڵان هەڵدەکێشن و چرای عەشق و خۆشەویستی خۆیان لە دەروونی وشە دادەگیرسێنن، ئەوسا ئەگەر باری سەنگین بوو زانیتان ڕێی دوورە، شەمشێرەکان بەشانەوە هەڵواسن با یادگاری بێ، خۆ ئەگەر تۆوی مەرگی خۆی هەڵگرتبوو لە نیوە ڕێدا پەلی دەن.

(هیچ شتێ لە ئارادا نییە، جگە لە شلّپەی ئاو و، خوڕەی
جۆگەلەی قەدپاڵان و قەڵبەزەی غەریبی ڕووباران)
دەنگی مەرگ: ڕەگێ نییە لە دوای تەمەنێکی درێژ
خۆرکەی ڕۆژگاری بەتینی لێ نەکەوێ
چەمێ نییە دوای هەزارساڵ
باوەش لە وشک و برینگی نەکاتەوە و
کرمی منی تێ نەکەوێ!

**زەمین:**

ئەو ڕووبارانەم خۆش دەوێن
سەرچاوەیان خوێنی دڵە





ئەو ڕەزانەشم خۆش دەوێن
کە تەمەنیان شیلەی گوڵە
دەرگا لەسەر مەرگی شومتان ناکەنەوە
هیچ ڕۆژگارێ،
گرەو لە جاویدانی من ناباتەوە!

**لاس**(١)**:**

بەڵام تەنها تۆ نەمری
ئەی سەر زەمینی عاشقان
دایکم دەیگوت باوە گەورەم دەیگێڕایەوە
کە هاتووینە سەر ئەم زەمینە بەرین و
پڕ چیایە...
بەرلەوەی کە گوڵ بچنین و بیدەین لە یەخەی دڵداران
ئێسک و پرووسکی نەوەکانی خۆمان تێدا شاردۆتەوە
بەرلەوەی قومە ئاوێکی کانیاوەکان
بکەین بەدەم
کار و بەرخی ساوای دڵمان
بەرهەڵدەینە قەرسیلەکان
گۆڕی قوربانی هەوارمان هەڵکەنیوە
بۆ ئەو مێرە بەرزە بڕو هەڵۆیانەی
کەپکە شاخیان نایە سەر شان
وێڵ و ماندوون بەدوای ژیان

**دەنگی مەرگ:**

دوگمەی حەسانەوە داخەن
دەبڕێنەوە
دوێنێ بوو مێگەلە مەڕێ.
ها ئە لەو شاخە هەڵدێران

شوانە کەپنگی خۆی سووتان
کردی بەدەمی سێدارە...
بڕۆن بگەنە تەرمەکەی
کرمی کەوتوتێ لەو خوارە

**کچانی دێ:**

هەیرۆ وەرن
چیا بۆنی دەستگیرانی – گوڵێ(٢)-ی لێ دێ
بچین ئاڵای سووری عەشق
لەسەر تەرمەکەی چەقێنین...
ئەو گەوە شاخە هەر وایە...
لەوەتەی هۆزی گەرمێنێ
پێیان لەو لووتکەیە نایە...
هەموو ساڵێ عاشقێکیان
لە جیاتی قوربانی دایە!

**کۆرسی نائومێدی:**

نەم وت خەرمان لۆغە نابێ
پیاوی چا بن ئەمساڵیش بارانیش نابارێ
بەهەلاسی دڵتان بێژن
نەرگزە جارێ ئەم کێوە...
بۆ تا هەتا
دەمرێ لە حەسرەت خەزاڵ و خاکە لێوە...
پیاوی چا بن...
ڕەشماڵ لەو شاخە هەڵم دەدەن...
زەمین مەکەن بەهی خۆتان...
ئێوە کۆچەری بن باشە...





**لاس:**

بەڵام تەنها تۆ نەمریت
دایکم دەیگوت باوە گەورەکەم دەیگێڕایەوە
ئەم شاخانە پڕبوون لە پەڕی ئەفسانە
ئێوارەکانی و ئاوەکان
لە پەڕی سوور هەڵدەگەڕان
کە خوێنی ئەو زەریانە بوون
لە جێی بەفرە کوڵی کێوی
نێو ئەم هەڵدێر و کێوانە
گوللە لە بەرۆکی دیلیان
دەبووە گوڵێکی دێوانە...

**دەنگی مەرگ:**

هەتا هەتا... نەمری و جاویدانی و ڕەندی
هەمووی درۆن
خاکتان لە تورەگەی منە...
ئێوە غەریبن پەڕیونە ئەم زەمینە
زووکەن بڕۆن...
دەستتان لە زەمین بەر دەبێ
ئاگر لە جەرگتان بەر دەبێ!
(خەندە و قاقایەکی مەرگاوەڕ)

**کچانی دێ:**

وەرنە ئەو دۆڵ و شاخانە
جارێ لە ئەشکەوتان گەڕێن
با بچینە جێ ئاگری دوێنێ شەوێ
شەو بەکێوان...
خوێنمان وشکی کرد لە لێوان...

چەپکە نەرگزە جارێکمان وا لە دەستە
ئاخر گوڵە زۆر بەهەستە وا بەڕێوە
پێ بزانێ خۆی هەڵدەدێرێ لەو کێوە!
(ڕادەچڵەکێن)

**لاس:**

ئەوە بارانە و لەسەرخۆ
بووکی پەلکە زێڕینەی خوا
بۆ زەوی دەگوازێتەوە
(کەون)ی لە باوەش گرتووە و
بۆ ئاسمان دەگەڕێتەوە
بۆنی ئەم خاکە غەریبەش
وەک مێخەکی گەردەنی تۆ
لە سینەما هەوری ناڵە و سۆز ئەیگرێ
بۆ دڵم دەپەڕێتەوە...

**خەزاڵ:**

ئەمڕۆ هەوری هاتنەوەی تۆ
نابارێتە کێوی قافی بێ ئارامیم
لە نێوانما گەورە دەبێت
خەریکە من ببم بەئەو ئەویش بەمن
ئای دڵی من کەسێ بەری خۆکوشتنی لێ ناگرێ
کێ ئەتوانێ دڵم کۆت کا
بەردەپانی پەڕینەوەی لە لەشی منا هەڵگرێ و
لەگەڵ داکەسانی جووت کا...

**دەنگی مەرگ:**

چرای چاوتان یەکجار کزە
ڕێ بەخوێنی لەشتان مەدەن





ئەوەندە توند توند ڕێ کەوێ!
لە هەناسەی خۆ تووڕە بن
با زریکەی لێ نەکەوێ
ئەو ڕەشەبایەی لە ڕێیە
ئازارێکی زۆری پێیە ، خۆشم ئەترسم بەرکەوم
هەی خاک بەسەر ئەو مێرانەی
ئارەقەی لەشیان چکاوە
بۆ وەی لە کەڵێ سەرکەون،

**لاس:**

ئەو پەڵە هەورە ڕەشانەی
لەسەر لوتکە دەگرمێنن
بارانێکی کەمیان پێیە
ئەی سەر زەمینی عاشقان
ڕێبوارێکی یەکجار زۆری عاشق بەتۆ
وا لە ڕێیە...

**کۆرسی نائومێدی:**

ڕەشەبا دێ ڕەشەبا دێ
هەرچی ڕەگ و ڕیشە هەیە
لە بێخەوەی هەڵدەکێشێ
ئاگردانی هەرچی عاشق و مەعشوقە
کوێری دەکا و دەیخاتە بەر
تەرمە ڕەنگی خۆڵەمێشی...
سەری لووتکە و کەڤری چیاکان هەڵدەگرێ
ڕێی پەڕینەوە و پردە باز
دەخاتە ڕک و هەڵدێران
تەپلەی مەرگ

دەکاتە سەری پاوان و خوێنی ڕەوەزە دوورەکان دەهەنجنێ...
پەڵەی سەوزی نێو زەنوێران
(شنە بایەکی مۆسیقی خەفەتبار و خەمگین)

**خەزاڵ:**

هاوڕێم بەنیگای غەریبی سورمەی چاوم
هەڵم گرتووی
لەناو جانتای شەپۆلی بیرەوەریما هەڵم گرتووی
تۆ بۆ ڕێگەی هات و نەهاتی خۆرەتاو
گڕ و سووتوی
هەوری لەشت بەسەر خاکی لەشم دادێ و هەر نابارێ
من نازانم ئەمە کەونە یا چاوتە وا گەورەیە
من نازانم
لە مەداری ئەم ئەستێرە پڕ لە عەشقەدا خول ئەخۆم
یاخود وەکو ئاوارەیێ لە مەداری چاوانی تۆ
کەوتوومەتە ئەم وڵاتە شەختە بەندە

**کچانی دێ:**

کوانێ هەلاس؟
ئاگر لە خەرمانەی سووری دەنگی بەردا
لوتکەکان بخاتە گریان
کوانێ هەلاس بەفوی شمشاڵی بڕستی
لەشکر و قۆشەنی مەرگ بخاتە ناو دەمی زریان؟
(ماندووبوون و هەموویان ڕادەکشێن)
(دەنگی شمشاڵێکی بەتین و گوڕ)

**کۆرسی نائومێدی:**

ئەو گرانیەی وا لە ڕێیە خورجینێکی پڕ لە مارە
دەخزێتە سەر پشتی زەمین



هەڵدەلووشێ هەرچی فەقیر و هەژارە!
(چەند تارماییەکی ڕەش و ترسناک سێبەر هەڵدەخەنە ئەو ناوە)

**لاس:**

ئەی سەر زەمینی عاشقان
تەنها هەر تۆی کە نەمری
سینەیەکی هەڵدڕاوی بەنێزەت لا ئازیزترە!
لەو سینەیەی کە مەدالیای دەچێتە سەری
ئەو گەردنەی کە ئەچێتە بەر پەتی ڕەش
لەلای تۆدا پیرۆزتر لەو گەردەن و بەرۆکانەی
کە ناحەجمێن لەبەر نێرگز و گوڵی گەش!

**کچانی دێ:**

مەگرین مەگرین...
هێشتا گوڵێکی زۆر ماوە...
دامێنی ئەو شاخانەیان
لە بۆنی خۆ شەتەک داوە...

**لاس:**

وەکو هەوری باد
ئاسمانی جیهان ئەگەڕێی
هەر ئەڕۆیت و لە کوچێکی بێ پایانی
شاخ و چەم و کانی و درەختی لەشی من
جێ دەهێڵی و هەر ناباری

**دەنگی مەرگ:**

ئەگەر تەرمی لالۆی[3] شوانیش بدۆزنەوە
گوڵێ بەشاخان کەوتەوە و
خۆ بۆ گیانم هەڵدێراوە...

ئێستا تامی گوڵان تاڵن!
دەوەگەڕێن بۆ ئەو قژە نەرم و لوولەی ئەو بناڵن...
یەکێکیان دادەکاتە ئەم وشانە و دەڵێ:
(ئەوە دەڵێم چوکەڵ ناسکە سوارەکەی من چۆتەوە
لەبۆ سەفەری دەگەورە و گران ئەمن ناترسێم،
لە کوشتنێ، لە مردنێ بەڵام ئەمن گەلەک دەترسێم بۆ
پولێکە دەسواران دەوری دەن و لێی بسێننەوە قەساسی
دەکۆڵمە گەزتنێ...)

**لاس:**

ئەی سەر زەمینی نێو دڵم ها لەم دۆڵ و لەم چیایە
گوێم لە دەنگێکی ناسک و ئاشنایە
تێیان دەگەم... ناوم دێنن
یا هەر نەبێ خوێنی دڵم ئەچڵەکێنن
بانگم ئەکەن...
(گوێی خۆت قولاخ دەکات و هەڵوێستەیەک دەکات)

**کۆرسی مەرگ:**

ئەوە دەنگی شنەبایە
کە هەمیشە بەر لە مەرگی هەژارەکان لە ئارایە
شلوێ مەبە بەم دەنگانە
شێتن ئەوانەی زیندەخەو
دەیانخاتە نێو گەروی تاری تەنگانە

**لاس:**

نا نا دەنگی دێ لەم شاخە
کە خەستی ئازار و داخە
دەڵێی...
(هەڵدەستێتەوە و دەستی دەخاتە بان گوێی...)



**دەنگی نائومێدی:**

دەڵێی چی ئاوا داماوی
لەناو خانەی خەیاڵی خۆتا ڕاماوی
نەتزانیوە...؟

**لاس:**

چیم زانیوە؟
هێشتا چرا دادەبیسێ...
پردی تاری دەڕوخێنێ...
ڕوبار لە شەپۆل ناکەوێ...
کەنارەکان بێ وچانە
ئەو دەنگانە هی پەرینە... هی خەزاڵن
کە دایکم هەموو ئێواران
ئەفسانەکانی ئەوانمان بۆ دەکاتەوە
پوش و پەڵاش و هێلانە...

**زەمین:**

تەختە تاوێرم زۆر زۆرن
هەڵۆکانیش بەرزە فڕن دەمپارێزن...
تۆ گوێ بگرە لە ئاسمانێ
(تەیرەک گاز دەکا... مەفتەنی من... مەفتەنی من![٤]
مەفتەنی ئێوە لە کوێیە...؟
کام پاییزی سەخت و نابار لانەی ئێوەی ڕەتاندووە
کام ڕەشەبا
پوشی ئێوەی قەپاندووە؟!

**خەزاڵ:**

باران دەبارێ ئەزیزم
ئەمڕۆ لە نسێی وێنەتا...
(باستەرناکی)[٥] دڵی تەنیام
بەفری هەموو نسارانی
ئەم (سیبریا)یە بەفرینەی لە پشتی خۆیا کردەوە
هەموو قەسەری تەنیاییم دەسووتێنم یادت دەکەم
یادی جۆگە و شەقامی -مۆسکۆ- یا چاوانت
لەناو دڵما نەمردووە...

**کۆرسی نائومێدی:**

زۆر ئەترسم ساماڵ خەنەی نەگرتەوە
بەفر و باران دایکاتەوە قاتوقڕی
کاروان ئیتر ناگەنەوە...
کەحێڵ لەژێر بەفرێ دەمرێ
شۆڕە سواران[٦]
ئەوانەی ئێوە یەخەتان بۆ لە خەندە و پرسە نایە
دوای بەهارێ درەنگ
بڕۆن لەژێر ڕەنوو بەفران
وا تەرمەکان لەوێ دایە؟

**زەمین:**

هەر کێ پشتم لە عاردی دا
ڕەگ و ڕیشەی لە ناخی من دەبێتەوە...
ئەگەر پۆلاشی هەبێتن
هەپرون بەهەپرون دەبێتن...!
لاس: ئەمڕۆ هەرچی وردە تەم و کۆلکە یاد و سروەی چیای
سەرم هەیە...



بەجۆباری وشە و سۆزی ئەو دەمانە
ئەی چۆن دەتوانم وا نەبێ...
ئەم هەموو ساتە شێتانەی خۆم بنێژم.
(دڵم تەنگە چی بەدڵی تەنگم بڵێم)[٧]

**کۆرسی کچان:**

وەرن ڕەشبەڵەک دابەستین
خەنەی پرسە لە دەست و پەنجەی خۆ بدەین...
چرای ڕەنگی دار ئەرخەوان داگیرسێنین
بەڵام هەرگیز واز لە تەرمی لالۆی شوان ناهێنین
هەموویان بەتێکڕا بەگەردنەی شاخ هەڵدەگەڕێن و
ئەو بەندە دەڵێنەوە:
(دە هەستە هەستە مەجنونە زیزە
لە دەوروپشتت سیس بووە
حاجیلە و گیا و فریزە...
کە جێمان هێشتی بەهار بوو
بەڵام ئێستاکە پایزە)[٨]

**زەمین:**

بڕۆن تەرمی عاشقی چیا بدۆزنەوە
لە ناخی دڵمی وەشێرن
هەر کۆمەڵێ ئێسک و پروسکی لە ناخی زەمین وەشێرێ
هەتا هەتا... ڕەشەبای مەرگ
تەختە تەمی نائومێدی پێی ناوێرێ؟!

**کچانی دێ:**

ئەو سوارانەی وا بەرێوەن
دەگەنە مەلە و کێوانە ئەگەر هەلاسیش بلوێری
تووڕەیی خۆی

بەرنەداتە شاخ و چیا، مێگەلان خڕ نەکاتەوە
ئەو سوارانەی چرای سووری خوێنیان پێیە
ئەسپ کەحێڵ و کەرەندی سووریان پێیە
کێوەکانی هەموو تەی دەکەن
غوربەتی چیا و خوێنی هەزاران شکۆفەی
تێکەڵ بەچەمی نەی دەکەن
(دەنگە دەنگی کوڕژن و هاژەی سواران و حیلەی بەسۆز)

**لاس:**

ئەوا من چووم... گوێم لە دەنگێکی چیایە
دەروونم دادەوەشێنێ...
شەمشێرەی چاوم هەڵدەگرم
یا دەگەمە ئەو کاروانە یا منیش لەو ڕێگە دەمرم
(پشتبەندەکەی خۆی دەپێچێتەوە و دەمامکی دەدا،
خەنجەرەکەی هەڵدەگرێ، لەبەر خۆیەوە دەڵێ:
ئای های...
(لەیلەی شیر و شەپارێ
چ زوو گەیشتیەوە مارێ[9]

**مەرگ:**

ئەگەر برۆی
شەربەتی عومری خۆت دەخۆی؟

**زەمین:**

ئەگەر شیلەی دڵی منت هەڵمژیوە
خوێنی هەزار ڕۆڵەی زیخ و ڕەوەندی کێو
لەسەر کوانوی دەروونی مندا ڕژاوە...
ئەگەر زمانی پاراوت بارانی گەنم و حاجیلەت
لەناو دەمی من پژاوە...؟



ئەگەر دەتەوێ کە پشتت قەڵای دەمدەمی مێژوو بێ،
دەبێ مرۆڤ بەدوای ئەو دەنگە بکەوێ
تا خوناوەی ئێواران و بەربەیانی جاویدانی لێ بکەوێ!

**لاس:**

دایکم دەیگوت، باوە گەورەم دەیگێڕایەوە...
ڕەوە ئەسپێ ساڵێ لەژێر بەفر و بۆران
لە سوارانی خۆیان تۆران...
سواریان گلان...
لەبەرئەوەی نەچوون بەشوێن ئەو حیلەیەی
لە دوورەوە بانگی هاوێ و کەلەکوێتی خۆی دەکرد
هەر سوارێ
لە ئەسپەکەی خۆی بتۆرێ و بیگلێنێ
زەویش باوەشی دایکانی لێ دەستێنێ!

**حیکایەت خوان:**

تاکو ئێستاش
ئەو نەوەیە بەدوای ئەو دەنگە دەگەڕێن
کە لە هەر لوتکە و شاخێکا
لە هەر ڕەوەز و باخێکا
دەنگی حیلەی ئەسپێ... دێت و دەبڕێتەوە
خەڵکی سووتاوی ئەو ناوە
بەشوێن ئەو دەنگە دەکەون
ئەوانیش ڕێیان ون دەکەن
لەژێر کەپکە شاخی مەرگ و ڕەنۆی برسیەتی دەخەون!

**پیرەکانی دێ:**

ئەم ئێوارەیە سەر زەمین بۆنی هەرا و زەنانی لێ دێ
بۆنی دەشتی بریندار و بۆنی تاوکەی باراناوی و





بگرە و بەردەی دەنای لێ دێ!
کوا پور عەلی سەر بخاتەوە ئەو کێوە
حەیرانی سواران تورِ بدا
ئیمڕۆ زەمین، پونگ و گیا و قەرسیلەکان
بۆنی تەنهایی و غەریبی لوولی داوە
دیارە ئێمە بێ خەبەرین
لەو تاراجەی کە ڕووی داوە؟

**حیکایەتخوان:**

پوور عەلی ئاگر لە دەنگی خۆی بەردەدا
حەیرانی سواران سەر دەدا
(ئەوە دەڵێم دەوەرە سوارە دیاری، بەڵام ئەمما لەمن دیاری
چەند شیرینە ڕانی دەرکێفی، دەستی دەجڵەوی، سەری دەسواری
ئەرێ سوارە بەخوای لە بنت دایە کوێتی، کە قاپ ڕەش و داوێن
تاری، گـــەردەن ســـەگـــلاو، سم کـــۆدەل و مـــەیدان دوور و کلک و یاڵ
بەژەنگاری...)(١٠)

**لاس:**

ئەستێرەکان، ئێوە خەڵکی شار و گوندی ئێوارانن
دەبێ دڵی منتان دیبێ...
بەکام ڕێگەی هات و نەهاتا پەڕی بێ،

**کۆرسی مەرگ:**

خۆ لەبەر خۆرەتاو هەڵخەن، ئێسقانتان گەرم بێتەوە...
سبەی چەنگاڵ و نەقیزەم، دەنێرمە سەر گیانی پیرتان
دونیا هەمووی زەنە بەفرە، ڕێگاکان دەنگ نایانبڕێ
پیریتان بۆتە خەرمان و
جەوالی مەرگ دائەگرێ!



**خەزاڵ:**

وەک ڕووبارێ
بەئەستێرەی شەپۆل و ڕۆخی تەمەنێ
ڕووناکی برژێننە شارێ...
وەک بارانێ
دڵۆپەکانی ئاورینگ و شەوچرا بێ
ببێ بەسەرمەشقی سەوزی نەوبەهارێ
ئەوەهام بۆم... ئەی دڵە شێتەکەم بەسە!

**پیرەکانی دێ:**

دیارە دەنگمان ناگاتە گوێی کەڵەکێوی
دەبا دەستمان لە ماشەی تفەنگ کلیل دەین
ڕوو بکەینە نێو ئەوان ڕەوەز و شاخانە
ئێمە ڕەگمان داکوتاوە
ئاگردانمان ئاوەدانە
وەچەی زۆرمان بەدواوەیە
هیچ ئازارێ لە تۆی برین سەرهەڵناداە
ئەگەر بەشاخیش هەڵدێرێین...
ئەوە دەستی داهاتوویان
لە ڕەگ و ڕیشە بەرنادەن

**دەنگی حیلە:**

ئەگەر بەفر و پروشەی چیا
هەمووی لەسەر پشتی کۆکم خڕبێتەوە
ئەگەر زریان هەردوو چاوم پڕ بکاتەوە
من خۆم دەتوانم ڕاپەڕم
بەڵام سواری سەرپشتی خۆم ناگلێنم هەتا دەمرم

**زەمین:**

گوێتان لێیە، چراویلکە لەژێر بای سەخت و بۆرانا
تاریکی چۆن دەڕەتێنێ؟
گوێتان لێیە خۆزیا دڵی لە پۆڵا با نەمردایە
(ئەی خوا بۆچی لەشی ئێمەی
لە پۆڵادا دروست نەکرد؟
بەرگری بێ کۆتایی خۆت بکردایە)[١١]

**لاس:**

من ڕۆیشتم ڕۆژ ڕۆژ تەمەنی بێزارم
دەسپێرمە ئەو لوتکانە و چاوی خەزاڵ
ئەو دەنگانەی وەک لەشکرێکی نادیار
هێرش دەکەنە سەر خوێنم...
من ڕۆیشتم نامەی هەواڵی ئاگریان لێ بسێنم!
یا لەگەڵ سواران دێمەوە
یا خۆم بەرکۆڵێ هەواڵ
(دەکەوتە ڕێ و سەرهەڵدەگرێ)

**دەنگی نائومێدی:**

ڕێچکۆڵەکان شەختەبەندی زستانێکی وەیشوومەیان
لێ کەوتەوە
هەزارەها ڕێبواری تر لەو ڕێگایانەدا مردووە
ئەو سوارانەی پار ئەو دەمە کەوتنە ڕێگا...
کەحێڵ تەرمی هێناونەوە
هێشتا پرسەیان هەر ماوە
لولاقی خۆت تەمێ بکە
نەکەن ببزوێن لەولاوە!



**ژنانی دێ:**

وەرن خاکی ئەو زەمینە بەسەر قژ و سەرمانا کەین
دەڵێن دوێنێ -گوڵی-ی خەمگین...
لە حەسرەت دەستگیرانەکەی خۆ لە بارزن هەڵدێراوە
وەرن هەرچی هشە و خەمە لەو دێراوە
بیخەینە سەر ئەو نەمامەی لە نیوەی تەمەنی خۆیا
وشکی کرد و بەسەر کۆکی خۆی ژاکاوە
(دەکەونە ڕێ و هەست ڕادەگرن)
ئێمە دەچین بزانین کێو لەسەر وەفا و قەولی ماوە
یا هەر وێڵی ئەوان بەفر و زریانەیە
کە عاشقی تەرم و چاوە؟...

**دەنگی مەرگ:**

ئەمساڵ ساڵێکی نەهاتە... هەمووتان مێوانی منن
خۆتان مەدەن لەوان بەفر و کێشە کێشە...
چەند دوور بڕۆن... هێشتا بۆ هەڵدێرانتان
سەدان خەرەندتان لە پێشە؟
ئەو لوتکانەی نایانگەنێ یەکجار دوورە...
ئەوەی بەدوای تەرمی سپی بەفرا هەڵێ...
زۆر گەلۆرە!

**کۆرسی منالان:**

(بەڕۆژ بەردەدا، بەشەو دەگری تا
ما خۆی چوار چاوان چ دەرمان دەدا[١٢]
منداڵان ئیمشەو، ئەو دێیە چۆلە
کوانێ مانگەشەو بەدوای چی وێڵە...
کوانێ ئەو دەنگانەی وەکو بلوێرێ...؟
کەمەرەی کچ و کیژۆڵەکانی...
دەخستە سەما... یا مەڕ دۆشین و سەر بەردەبێری...





**دەلو:**

کوانێ خوانەخێ وا لە برسانا سەرم بۆتە هەنگ
لەگەڵ دەروونی خۆما دێتە جەنگ؟
(هیچ دەنگێ نابیسێ و لەبەر خۆیەوە ئەم شیعرە
دەخوێنێتەوە)
(ئەمشەو دیارن بانگم بێ شەرمن
زایەڵەی سەمتوور کەللەکەم گەرمن)[١٣]
(بایەکی توند دەرگای حەسارەکەم دەخاتە سەر
گازەرەی پشت و دەڵێ:
(شەوەن خەڵوەتەن ماڵ بێ ئەغیارەن
عالەم گشت نوستوون دۆست...)[١٤]

**خەزاڵ:**

بەتەنها تۆی...
وەکو شیعر لوتکەی دڵت داگرتووە لە خوێنیشا جێگەی بەندی
ڕەگت لەسەری غەریبیم
دەرکردووە
(لەبەر خۆیەوە دەکەوێتە بالوورەوە دەڵێ:
(ئەگەر دەکا خوداوەندی میری مەزن، چوکەلە
سوارەکەی من
دێتەوە لەوێ شەڕێ جەنگێ جدایێ
شەرت بێ نێوان سینگ و مەمکانی لە بۆ بکەمەوە
بەباخچە و گوڵ و ڕەیحانان
هەروەک مەلایەکی دە دوازدە عیلم تێیدا بکاتەوە متالایێ)

**لاس:**

ئەی خەزاڵم
ئێستا بەتەنها تاقە دەنگێکم...





لە شاخی پێشما دەنگ دەدەمەوە...
کوان ئەو دەنگانەی
ئاگری سووریان بەر ئەدایە نێو خەرمانەی دڵم؟
کوان ئەو هەنگانەی
سەریان دەکردمە کەندوی چیاکان؟
دە گەرووی خۆتان تاقە جارێکی تر لێک کەنەوە
تاقە جارێکی تریش شەمشێرەی وشە ئاگرین
لەنێو کالانی گۆرانیەکانی خۆتان دەربێنن
دونیای دەروونم بکەن بەبرین...
(هەست ڕادەگرێ، دەنگی نییە...)

**حیکایەتخوان:**

پیرە پیاوانی ئەم گوند و دێیە...
ئێستاش لە ڕیزەی بەفر و پروشە چاویان لە ڕێیە
ئەو شۆڕە سوارەی هات و نەهاتی
لە خورجینی خۆی بکا بەدەمی خلتانی خوێن و
شڵپە و سۆی شەتاو
ناگەڕێتەوە تا لەگەڵ خۆیا چەپکێ ئەهێنێ...
لە خونچەی هەتاو
(دەستی دەکاتە سایەبانی چاوی و سەیری دوور دوور دەکات)

**دەلو:**

دەرگای حەساری ماڵی خانەخوێم...
بەسەر پشتەوە...
نە دەنگی زیقەی ساوا دەبیسم
نە ئەو دووکەڵەی سەبیلەی گەرمی کوێخای دیوەخان
نە تێکەڵاوی کوڕان و کچی سەر کانە ئاو و
بیرەکەی حەوشە...

کوانێ ئەو دەنگە نووساوەی جار جار
بانگی ئەکردم؟
لەسەر سفرەی خی تێری ئەکردم؟
(ورگی خۆی هەردەلووشێنێ!)

**کچانی دێ:**

هەیرۆ هەیرۆ هەیرۆیە
ئێمە چاومان لە ڕێیە
دڵمان پێتەختی مەرگە
ئەوەی لە شاخ ون دەبێ
یا گلێنەی چاومانە
یا وەتە کزەی جەرگە!

**زەمین:**

تەیر و تواری ئەو کێوە بەربوونەتە ئەو ناوە
بۆنی تەرمی کوڕانم دەخزێ بەسەر گیانم
لە هەر شاخێ نەمامێ...
هەر بیستانێ شەمامێ...
پرچ و چاوی کچانە... دوێنێ بەفر ڕاپیماڵێن
شاڵ و شەدەی مێرانە
لە چاوەڕوانی سواران کە ڕەشەبا ڕاپیماڵێن

**لاس:**

کە بیر لە کانی ژێر تارای ئەو دەمانە دەکەمەوە
وردە فرمێسکی منداڵیت
لە سۆی دەموچاو لێک بەردان
بۆ سەر زەوی هەردوو ڕوومەتت هەڵدەڕژێت
سینە دەبێتە درەختی
بەر خۆرەتاوی هۆنراوە...





شاری لەشم پڕ لە وردە برین دەبێ
ئێستاش لە چرای بێ دەنگی
ئای کە بێ دەنگی دەریایە ئارامم لێ هەڵدەگرێتن!

**حیکایەتخوان:**

کۆڕی ڕێواسە کچان
لەگەڵ مێرگ و سواران
ئەسپی کەحێڵ و کوێتی
حدود و بەڵەک چاوان
مێرد منداڵ و پاژەرە
کار و بەرخ و خوناوە
هەیرۆ و بگرە و دایەرۆ
لەژێر بەفر و پروشە، لە گەردن و قەدپاڵان
هەڵۆی سوار ئەزریکێنن لە حەسرەت هەردوو باڵان
ئەو مناڵانەی کە خوێنی تۆیان دەکردە،
چرای ڕێگە و دارستان
سبەی کە بەهار دێتن پرچیان دەبێتە گەڵا
(کاروان هەروا بەرێوە)

**تاقە کچێ:**

دەنگی شمشاڵێکی دوور... دەروونم دەقرچێنێ
بەدیار مێگەلە مەڕێ... بەفر دەخاتە سەما
چیا هەڵدەپەرێنێ...
کام گوڵی چیا بەفرینە خوێنی لالۆی تێدایە
کام شنەبا خەمگینە تێکەڵ بەتەمی ژینە
ئەو گیایەی کە لەو شاخە
کە ئێستا لەژێر زوقما هەمووی برین و داخە
سبەی کە سەر هەڵدەگرێ و دەکەوتە بەر هەنسکە

لقوپۆپی کچانە چاوانی منالاّنە
دەنگی سوارانی بەفر... لە دامێنا دەرسکێ...!
(لە حەسرەتان دەکەوێ)

**خەزاڵ:**

لەوەتەی ساڵ ئاوا بووە، بەفرە بینم
بەزەیی خاک وەکو بێچووە چاوێ خەوتوو
بۆ خەونێکی دوور براوە
ئەی هەلاسی لە دووری من...
لەشم بۆتە ڕەفتەیەکی ژێر دیوانی
بێ هۆنراوە

**لاس:**

پێم شەکەت و کەشەنگم
بۆیە لە چیا بێ دەنگم...
چرای چاوم لە برسان... ڕێی هەڵدێران نابینێ
ها ئێستا نا ئێستاکە نائومێدی دام دەگرێ...
مەرگ وەک دڕندەیێ، هەڕ و گیفم بۆ دێنێ...
ماندووم لولاقم لەنێو زوقم بەفر و هەراسان
پێشم ناکەوێ هاسان... ئاخ ئەو برینەم گەشە
لەو دۆڵ و چیایانە... ئاخ ئەی خەزاڵی دڵم.
بەخوا وەرزێکی ڕەشە...
(دەکەوێ و دوا هەناسەی بەزەحمەت هەڵدەکێشێ)
(شنەبایەکی خەمگین لە شێوەی مۆسیقادا)

**مەرگ:**

ئەو ئاستانەی من هەمە بەقەد زەمین والاّیە
ئاسمان ئاسا بەرینە...
ئەو کێلانەی من هەمە. بۆ ئێوە وەک سەرینە!





**تاقە کچ:**

ئەی ئەو مەرگەی چەنگاڵت
ناوەتە نێو دەروونمان...
هەرچەندە بەفر دامپۆشێ
زریان کە سەرم بگرێ
سواران چوونە خۆر بێنن
من لە چەنگت دەربێنن
ماینە حدودێ هەردێ، بۆنی تەرمەکەم بکا و
لە دیارما سمکۆڵ باوێ و لێم بکەوتە جموجۆڵ
لەیلە و مەجنونێ دەبێ بەو کێوانە بکەون...
هەروەکو چەپکە گوڵێ... تەرمەکەم بخاتە کۆڵ...
(زریان دایدەپۆشێ!)

**حیکاتخوان:**

بەفرێکی سوور دەبارێ...
بڕستم لێ بڕاوە دەنگ لە گەرووم دەتارێ
ڕەنگە ئەو ڕێیە نەبڕم
منیش وەک ئێوە بمرم...
بەلاّم بەرلەوەی بمرم
ئەو لوتکەیەش تەی دەکەم...
سەری سواران دەبینم
ئەوساکە ئۆخەی دەکەم...
سەری سواران دەبینم
ئەوساکە ئۆخەی دەکەم...
(بەلاّم هەڵدێر وەک دێوێ.)
(سوارە دوورەکان گوێی خۆیان کلۆر دەکەن و ئەم دەنگانە لە بالاّی سەری خۆیانەوە دەبیستن:

هێلانەکەم لە دوورە... ئەگەر وەک هەڵۆ نەفرم
ناگەمەوە مەفتەن و لە حەسرەت وڵاتی خۆم
وڵاتی پوش و پەراش هەر لەو ڕێیەدا دەمرم)
(کپ و بێ دەنگی ئەو ناوە دەتاسێنێ)

**زەمین:**

من تەمەنم درێژە... ڕەگم لە مێژوو ناوە...
سەد تەتەر و هۆلاکۆ... لە قەد شاخی زمناکۆ...
پشتم بەزەوی داوە...
نەیرۆنم نا بەلاوە...
بەڵام من وەک فریزێ
سەرم هەر دەرکردەوە و لە دڕیا ڕاپەڕیوم!
زۆر وەیشوومەم بینیوە...
ڕەگ و ڕیشەی درەختی لە بێخا هەڵکێشاوە
بەڵام من وەک زەمینێ...
تا تاقە کەسم مابێ... چرای چاوم دەبینێ...
هەتا تاقە مرۆڤێ خوێنی لەشی ڕژابێ
دەستی بڕست و تینی لە ڕەگی من بەرنابێ!

**تاقە کچ:**

لە دوا هەناسەی خۆیا کە زریان هیلاکی کردبوو، چەپکە
گوڵە کێویلکەکەی نابووە کەمەری و دەیگوت:
(قاز و قوڵنگیش تێپەڕین... بۆ سەر زەمین و لانە
گۆرانی خۆیان چڕین!)
(دوو دڵۆپە فرمێسکی گەش لەگەڵ زریان تێکەڵ دەبێ و هەناسەیەکی
کۆتایی سارد گیانی دادەگرێ)

**١٩٨٣**





ڕوونکردنەوە:

(١) لاس و خەزاڵ، لێرەدا تەنها وەکو ناو بەکارهاتوون نەک وەکو ئەسڵە فۆلکلۆرییەکەیان.
(٢) گوڵە – لە دەشتەی کە زەمانێک لێی بووم، باسی ئەو ئافرەتەیان بۆ دەکردم کە گوایە لە بڕی دەستگیرانەکەی دوای داخوازی و بەنسیب نەبوونی بوو بەمیوانی خەرەندێ و نەگەڕایەوە.
(٣) لالۆ هەمان مەسەلەی گوڵەیە.
(٤) هێمایە بۆ خۆشەویستی نیشتمان، زیاتر دەگەڕێتەوە سەر ئەفسانەی کوردی کۆن.
(٥) باستەرناک –هێمایە بۆ ڕۆمانی– دکتۆر چیفاکۆ.
(٦) شۆڕە سواران – کۆمەڵێک سواری مەزن بوون کە لە بەفر خنکان لە ساڵی ١٩٧٧دا.
(٧) لە گۆرانییەکی بیانی وەرگیراوە.
(٨) فۆلکلۆری کوردییە بەدەستکارییەوە.
(٩) فۆلکلۆرە، هێمایە بۆ ئەوپەڕی بێ قەراری.
(١٠) حەیرانی کوردییە بەناوی –سوارۆ– هەر ئەوەندەی دەزانم کە یەکێک دەیلێت ناوی –حاجی–یە؟
(١١) دیرێکە لە ڕۆمانی –ئازادی یا مەرگ–ی کازانزاکی کە گیانی بەرگریکردن دەخاتە دڵ و ئیحایە بۆ ئەم کارە.
(١٢) گۆرانییەکی فۆلکلۆری کۆنی منداڵانە، شەوانە دەیلێنەوە.
(١٣) هی مەولەوییە.
(١٤) هی مەولەوییە.

## خوێنەری بەڕێز:

من هەرگیز لەگەڵ ئەوەدا نیم کە بۆ چەند وشەیەک فەرهەنگۆک بخرێتە ڕوو، چونکە بەپێویستی دەزانم ئەم ماندووبوون و سەرگەرمیە بکەوێتە ئەستۆی خوێنەر و ئەویش تەکانێ بدا، بەڵام چی بکەم؟ باوە و منیش ئەم چەند وشەیە دەکەم بەدیاری ئەو قسانەم بەبێ ئەوەی کە بایەخ بەئەلف و بێ بدەم.

کەڤر: گابەرد، بەردی زل زلی دامێنی چیا.

کەرەند: ئەسپی کەرەندی، سورخن.

گەوە: گەوە شاخ، پێچی شاخ

گەلۆر: کەلحۆ: گەمژە.

نسێ: سێبەر.

ناحەجمێن: داناکەون، لە جوڵە ناکەون.

نەقیزە: زیاتر ئەو دارە سەر تیژە دەگرێتەوە کە بۆ ڕادانی ئاژەڵ بەکار دێت.

زەنە: پەلە، زەنە بەفر.

زیقە: زیقەی ساوا، گریانی ناوەختی مناڵان.

زریکە: دەنگێکی دوای ئازارێکی سەخت.

زوقم: شەختە یا شتێکی لەم بارەوە.

بڕست بەتین، تین، هێز و گوڕ.

چراویلە: چوکەی چرایە، چرایەکی بچووک، چوڵە چرا، قەندیلۆکە.

هەراوزنا: هەراوهۆریا، گەڕەلاوژە.

ڕتاندن: گۆڕینی بارێک بۆ بارێکی تر.

حاجیلە: گیایەکی گوڵینەیە لە دەشتەکانا شین دەبێ.

قۆشەن: لەشکر.

خورجین: کیسە، جۆرک، هی ئەسپە، یا مرۆڤ لە کاتی سەفەردا بەکاری دەهێنێت.

خەرمان لۆغە: ڕەمزێکە بۆ بەخشین و ڕوونبینی.

یاڵ: وشەیەکی فارسییە بەڵام کوردیش بەکاری دەهێنێ بەمانای بژ.

قەسەر: پوش و پەڵاش.



## وردەگەڵ

(١)

چەند ئەستەم بوو
گڕی ئەوینێکی پیرۆز
لە دەفەی سینەم سوور دەبوو
ڕێشم تا دەهات دژاور و
ئەستێرەی بەختم دوور دەبوو

(٢)

باڵابوو لە کۆڕی درەخت و دامێنا
پێشەنگ بوو لە پرسەی ئەو ئاسۆیە سوورەی
دەگەوزی لە خوێنا

(٣)

ئەو بایە چەند سەختە
درەخت و هەور و کاژ
تەمەن و ئومێد ڕادەماڵێ
نامۆیە بەحاڵی مرۆڤێ
ڕۆژ نییە پێستی لەو شاخەدا نەماڵێ

(٤)

زانیم گۆرانی ئەو شایە
ئەو بۆ ئاوات گەدایە
کۆتایی هات
لە دووچاری ئەو کۆرپەیەی
وەک خەنجەری

ژوانی نێوان ئەوینداران
لە نێوان هەردووکمان دایە

(٥)

بریا مەرگی ئەو گەڵایەم لەبەر چاو با
وەتاغم پەنجەرەی وای تیا نەبا
زۆر دەترسم مەرگی منیش
وەک مەرگی ئەوان بەتاو بێ

(٦)

تاقە گوڵی دامێنێکم لێ دیارە
لە دوورەوە وەکو پشکۆی ئاگردانێ
دادەگیرسێ و دەتوێتەوە
لەنێو هەزاران باراندا
هەر بەتەنها
گەواڵەیەک ئەو دامێنە دەگرێتەوە

(٧)

مەلم دەبینی دەهاتن
سوور دەچوونەوە لە ئاسۆی
مات و خەمگینی ئێواران
دڵی بریندارى منیان
پڕ لە خوێنی حەسرەت دەکرد
دەیاندامەوە غوربەتی
ڕەوەزە شاخ و لێواران



(٨)

ئەی پروشەی خێڵی پاران
بمدەوە دەست ئەو یادانەی
منیان لە ئێستاکەم تۆران؛
ئێوەش ئەی لوتکە دوورەکان
هەڵمدەنەوە نێو خەونی ئەرخەوانی جاری جاران

(٩)

شەڕابی جامی ڕەوەندان
مەستی سەفەری دەکردم
بەڵام هەمیشە بەرلەوەی
کەلی شاخێ جێ بهێڵم
لە نیوەی ڕێدا دەمرم

(١٠)

زۆر جار دەمەوێ گریانم لە بازوقە خوێنی سینەی بەر پەنجەران
نەرمتر بێ
یا کۆڤانم
لە هی مەم و خانیی شاعیر گەرمتر بێ

(١١)

ئەگەر دوو باڵیشم هەبێ
بەرزە فڕی
هەر هی هەڵۆ و هەر هی بازە
ئەگەر خەونیشم گەورە بێ
هێشتا هەر بەقەد شیعرێکی نەنووسراوە
هەر نیازە...

(١٢)

چۆن دەزانم؟
قژی نێوان زەوی و ئاسمان ببڕمەوە
خۆم لە ڕابردووی پڕ تاسەم بکڕمەوە
چۆن دەتوانم؟
سێبەری بازی پڕ شکۆ
لە مانگە شەوی شاخەکان بسڕمەوە

(١٣)

چەقۆیێ ئەشک ڕێژ کرابێ لە گریان
نامۆ بێ لە خەونی شاعیرێ
هەمیشە
خۆڵەمێشی گەرمی قەقنەسە
دوای سووتان

(١٤)

ئەی زێدی خۆم
بێ تۆ زیندوویێکی بەندم
تاشە بەردێکم لەژێر گۆم
ئەو برینە گرانەی جەستەم
لە خەرەندی پڕ مەترسیدا تل دەخۆم

(١٥)

دەزانم پاییزە
گەڵایان دەداتە تەنهایی تەلارێ
دوور بێ لە شەپۆلی گڕ ئامێز
یا تەونی پڕ لمی ڕووبارێ



(١٦)

با دڵم پڕ بکا لە داخی
مشت کلۆکۆی سووتان
بمباتە سروشتێ
نامۆیێ لە کەسێ کە گیانی خووڵقابێ
لە پشکۆی ئاگر و لە تولفەی زریان

(١٧)

گریان گوڵێکە ئەبەدی
لە کێڵگەی ڕۆحم شین بووە
گریان ئەو کۆترە شینەیە
لە لیسی شیعر دەنیشێ
بەڵام هەمیشە دوور بووە

(١٨)

چی خەیاڵە و چی خۆشیە
لە خانەقای دڵی منا
ژەنگی بوونە و خەفەت و ژەهر نۆشیە

(١٩)

گەوهەری ئەو دڵەم بۆ کێ دابڕێژم
کام گریان بکەمە ئەفسانە و
ئاواتی کۆنینەی خۆمی تیا بنێژم





(٢٠)

كە چلێ لە قەدی خانەزای دادەبڕێ
دەبێتە دەوەن و ئاگر و پووش
دەبێتە هاوەڵی ڕێبوارێ
هەڵەموت ئامێز و دار ماڵی بەفری تووش

(٢١)

ئای ئەم کێوانە چەند تەنهان
دڵی من و ئەو کێوانە
وەکو یەک وان
یەکێ لە تەم
ئەوی دیکەش لە خەم پەنهان

(٢٢)

ئەی زات
وەرە دەست لە ملی شاعیریم کە
با تێپەڕین
ئێمە تەنها و بێ تەخت و تاج و سێبەرین

(٢٣)

ئای زۆربا خان
ئەم چرایە با هەروا بێ
تۆ خەنجەرێکت دۆزییەوە
دات لە سینەی نالەباری
تا هەتایە سارێژ نابێ



(٢٤)

کۆچ بکەم من
یا لە دۆزەخی گومانا
درەختی یەقین بچێنم؟
نە دەبوو ئەو پەنجەرانە
بخەمە سەر گازەرەی پشت
نە دەبوو چرا بشکێنم!

(٢٥)

نە دەیگەمێ و نە لەبەر چاوم ون دەبێ
نە دەیگرم و نە لە سینەی من پێ دەبێ
تا ئاگری ئەو ئەڤینەم دادەکەوێ
نە هەنیەی سەوزی ئاسکیش
جارێکی دی دەردەکەوێ

(٢٦)

چەند پیرۆزن
سینەمان دەکەن بەلوتکە
هەڵۆی هەمیشە بەرزەفڕ
شیری پیاوەتی لە دەمی ئێمە دەکەن

(٢٧)

ئەمەیان گۆڕی ڕەندێکە
با لەسەرخۆ و بەشەرمەوە
بەفرمێسکێکی گەرمەوە
بنوشتێینەوە سەر ئەژنۆ.

(٢٨)

هەوار دوورە
هەر تروسکەی بەردی چیا بەدی دەکەم
ئێوارەم بۆ ڕوون کاتەوە
هەر ورشەبای ڕەزەکانە
دڵی تەنگم بداتەوە

(٢٩)

غوربەت بەردێکە لە ئارموش
بەرۆحی مرۆڤ دادراوە
غوربەت پەنجەرەی سامالە
بۆتە ئەڵقەی تەنگ و تریسکی
ئەم کەونە تاڵ و داخراوە.

(٣٠)

ئاسک ئاسا وەدەرکەوتی
مەچەکت لە خەنەی دڵم سوور کرد

(٣١)

ناچارم چاوم دابگرم
نەوەک لە هالاوی گەرمی
برینی سینەما بمرم

(٣٢)

سەیرکە ئەزیزم
شەوقی نێو برینی ئەمدیو و ئەودیوم
چۆن بۆتە تاجی سەر
ئەدگاری وەک گەلا وەریوم





(٣٣)

کە ئاوابوو
پێکی مەستیم کوژایەوە
هەرچی جوانی ئێوارە بوو
پەری ئاسا لە چاومدا توایەوە

(٣٤)

قوڵینگی سپیم دەبینی قەتار قەتار
گڕی ئەوینیان لە سەختی ڕێ بەردەدا
کۆنە یادم دەکولانەوە
هەردوو چاوم تەڕ تەڕ دەبوون

(٣٥)

لە لوتکەی گیانی خۆم دابەزم
چرای کام ڕێگە و بان پێ بکەم
کام تاوڵی کۆچەریان ئاوەدان کەمەوە
دڵی کام برینم دەمەوە

(٣٦)

دواجار بوو... هەر بەتەنها
یەک باڵۆرەی سەفابەخشی بۆ من دەچڕی
دواجار بوو... هەر بەتەنها
باسی یەک ڕێژنە بارانی دووری دەکرد
باسی یەک بست هەور و
یەک ڕووباری ڕوونی دەکرد

(٣٧)

شنەبا
کە سینەی دامێن و ڕێزە چیا جێ دێڵێ
زۆر پرچ و شاکەزیان ئاڵ دەکا
دڵنیام ئەو بایە
لە درەختی کپی گوندەکەم هەڵدەکا

(٣٨)

چرا دیاربوو لە دوورەوە هەڵدەتروسکا
گیانی منیش شەلاڵی شیعر و شەرابی ترێ دەبوو
ڕێگەشم پڕ لە پابەند و گرێ دەبوو

(٣٩)

کە هاتی
دارستانیش ئامێزی پڕ دەبوو لە گەڵا
جۆگە ئاویان ڕادەگرت
کەناریش قژی پڕ دەبوو
لە بروسکەی سپی چیا

(٤٠)

بەیانیەک کە کۆتی خەو چاوی بەردام
گریەی ساوای ڕۆحێکی ئاڵ
منی شادی لێ تامەزرۆی خستە سەر چۆک
ورد ورد ئاگری یادێکی لە دڵ بەردام



(٤١)

نامەوێ ڕۆژم لێ دابێ
ئەو خەمەت ببێتە کۆت و مارەزیوی بەر گەردنم
بەسەر شان و ملم دابێ

(٤٢)

بڕستی تەمەنم شکا
تەمی ترۆپکان دەپڕژێ
بۆیێ جار جار
چاوەکانم لە ئاست مەرگی تۆ دادەگرم
فرمێسکم بەگوڕ هەڵدەڕژێ

(٤٣)

ئەلەوێدا لە تەمی سەر ترۆپکان و
لە دووکەڵی سەر پشکۆدا
لەنێو هەزاران هەزاران
ئەستەمی سەخت و نسکۆدا
لە من دەرگا واڵاکردن
لە تۆش نەهاتن تا مردن

(٤٤)

ئاخۆ چ برینێکی کۆنە
کۆرپەیان دەلاوێننەوە و
وردە وردە دەگرین

(٤٥)

ئەو دڵەی من دەڵێی درەختێکە تەنها

تێکەڵ بەتەمی شاخ بووە

دەڵێی نالییە بەتەنها سواری بۆراقی ئاخ بووە

(٤٦)

سەیرکە ئەو دڵەم

دوای ئەو هەموو حەمکە ساڵە

لە حەسرەت شەفەقی چاوانت

هەر دەڵێی مناڵە

(٤٧)

دڵم توندە دەڵێی چیاییێکە بێ کانی

بێ ڕەز بێ کەڤر

بێ خوێنی زیندەگانی

(٤٨)

لە پەنجەرەوە ڕا دیارن

ئەو مەلانەی کۆمەڵ کۆمەڵ

بۆ نێو ئارانێ ڕەو دەکەن

ئاخ بۆ یەک جاری دونیای من

پڕ لە برین و شەو دەکەن

(٤٩)

لەو مێرگ و پاوانە سۆترم

هێشتاکە رەوەند و کۆچەری چیاکان

لە ڕۆحیا نەخەوتوون

ئێواران شاژنی خۆرەتاو بەجێیان دەهێڵێ



(٥٠)

بارانێکی تووش لێی داوم

بەدوای ئاگرێ دەگەڕێم

تەنها لە گوندە دوورەکەم دەست دەکەوێ

هەم دیارە و هەم نادیار

دڵنیام ناگەمەوە جێ

(٥١)

گریان و سۆز

دەڕژێنە نێو کوانووی برینم وەک باران

هێندێ مەشخەڵ تروسکە دەدەن

دەکەونە سەر قوببەی بەفرینی بناران

(٥٢)

ئەوە بالۆرەی ئەو دایکانەیە بەکوڵ ئەگرین

با دەیانهێنێ و تێکەڵی تەم تومانی شاخیان دەکا

ئەو ناوە پڕبووە لە مەلی فرمێسک و گرین

(٥٣)

سەرچاوەی دوودڵیم

مینای ئەو پەنجەرە دوورانەن

دیارن و دیار نین

هەندێ جار لە چاو ون دەبن

جارجاریش بارە کچیان تێدا دیارە و

دەشتایی دەگرن چین بەچین





(٥٤)

نە هەورێ لوتکەم دەگرێت و

نە بەفر گۆنام تەڕ دەکا

نە وەرزێ بەسەرما دەخشێ و

نە بارانێ

تاجی گەشی

پەلکە زێڕینەی ئومێدم لەسەر دەکا

(٥٥)

گەڵا دەڕژێتە ژوورەکەم

گەڵای ڕژاو

هەزار و یەک زام و برین

هەر گەڵایێ کوختێکم بیر دێنێتەوە

کۆستی کەوت لە نسکۆی سووری چل چرایێ

(٥٦)

لە گوڵی دامێنێ ماندووتر ڕێ دەگرم

لە پشکۆی ئەوین دادەگیرسێن

تا مردن...

پێشکەشە بە:

ساجیدە سەبووری هەموو ساتەکانم
بە زریڤان و زەنوێر
کاریز و زنار
داستان و ئاسۆ



## کتێبی نۆستالگیا

- کەڵەکێوی
- ئەسپەکان
- ئاسکەکانی نێو شووشە
- نۆستالگیا
- لووتکە
- پیری بخور
- هەڵوەرین
- بەختەوەرەکانی سەر زەوی
- تەوقی وشە
- شاعیر





## کەڵەکێوی

ئەبارێ و نابارێ
ئەبینم یەکێ دێ و لە پەنا سووچێکا
زۆر بەتاسووقەوە چاوەڕوانیم ئەکا
ئەیناسم... نایناسم
جار جارە برووسکی چاوانی
وەک چاوی کەڵێکی بریندار
دەستم پێ شل ئەکا
لێی نزیک ئەبمەوە و ناگەمە ئاکامی
دەستم لە سێبەری بڵندی گیر ئەبێ
ئەوەندەی پێ ناچێ
وەک ئەسپی ئەفسانە ون ئەبێ
سینەشم وەک زمانی کێوی
کە بێچووی لە شاخی هەڵزەنێ
پڕ ئەبێ لە عەتری سەرسامی
ئەچمەوە سێبەری کەپرەکەم
داستانێ تەی ئەکەم گریان و ماتەمە
دێتەوە
ئەوەتا بانگ ئەکا و بانگ ناکا
نەمامی هاواری لە سینەم گوڵ ئەگرێ
سمی ئەسپەکەشی برووسکان لە تاوێر
هەڵئەگرێ
لێم گەڕێ بتناسم ئەی ڕێبوار
دەزانی چەند ساڵە دەسوتێم بەترپەی
کەشەنگی پێتەوە
ئەمجارە سەیری هەوری ڕەشی ئاسمانی





دوور ئەکا
پەنجەکانی سڕن
چاوی ئەسپەکەشی لە بەفر کول بووە
بەمەچەک فرمێسکی خۆی ئەسڕێ
ڕێی دووری نێوانمان بەچەقۆی دیقەتی
خۆی ئەبڕێ
دڵێکی برین بار، کورژنی چیا بڕ
هەر سەیری پەنجەرەی ئەو ئەکا
چاوەڕوانی تەمی بێ بنی شاخانیش
پڕ لالەی خوناوەی بۆن بەفری شەو ئەکا
گریانم بوو بەمەل
ناچاربووم کەڵەکێوی دووری لە فڕین بۆ
باڵ کەم
ئەبارێ و نابارێ
ئاگری شەوانەی ئەو گیانە نامۆیەم
خۆڵەمێشی مەرگی تیا نییە هەمیشە هەر کەیلی مەشخەڵ و گریانە
چونکە من ئەزانم یەکێ دێ و چاوەڕوانیم ئەکا
ئەیناسم نایناسم لەم تۆف و زریانە.

## ئەسپەکان

بەیانیان ئەو ئەسپانە...
ئای بەیانیان ئەو ئەسپانە چەندە خورتن
نقومی تەم و بریسکەی شیر و تیرانن
دەڵێی شیری شێریان پێیە...
لە بێشەڵانی جوانانەوە هاتوون
عەتری ماچیان لێ دتکێ...
بژیان درێژ دەڵێی تولەماری ڕێیە...
لە گزیر کوشتن ڕاهاتوون
حۆرین پەرین -چاویان گەورە- تا ڕەت دەبن
برووسکان داوێن...
ئەو ئەسپانە هەر دەڵێی لە وڵاتی قەفقاسێوە هاتوون
بەربوونەتە ئەو کێوانە...
چەند ژیکەڵەن سینەیان پڕە لە ئاگری ئەوین
چەند بڵێی جوانن... مەرجانێ ڕژاوی زەوین
شەرابی هەزار ساڵەی شەوین...
لە ئاست چاوی تێر نەدیوی پڕ تاسەما
دڵیان بچووک چاویان کزە، سەریان نەوی
بەیانیان ئەو ئەسپانە
ڕوومەتیان وەنەوشە ئاسا دەریایان وەخرۆش دێنن
بژیان دەڵێی لاولاوە کە تێت ئاڵان لێت نابنەوە
ئەو ئەسپانە عەگیدن... سورخن و کەحێڵن
وەلێ ئەفسووس دڵیان بچووک - جێی هیچی تیا نابێتەوە
چاویان کز... بەرپێی خۆیان نابینن...



لە بن کەوش و سینەیاندا
ڕمی ڕق و ژەهری مەرگیان شاردۆتەوە
ئای ئەو ئەسپانە چەند جوانن دەڵێی لە بەهەشتەوە هاتوون
ئای ئەو ئەسپانە چەند دڵ ڕەقن دەڵێی لە دۆزەخەوە هاتوون





## ئاسکەکانی نێو شووشە

کۆمەڵێ درەختن لە سێبەری فرمێسک
خەونیشن لە گەڵا
ڕووبارن لە شەختە
ئەسپە شێن لە شووشە
هەوێردەن لە مینای سابلاخێ
لە ژووری با و بۆران وەڕسی و بێزاری ئەم چاخە
لە ئاڵتوونی ئارام و سەبری خۆ دەگرن
کۆمەڵێ دامێنی سەرکێشن پیاوەتی لوتکەیان
لە تەنهایی خۆیان بەرداوە
بەیانیان، نیوەڕۆ و ئێواران بەو تیشکەی لە پیرۆزبایی چاویان
هەڵدەقوڵێ
کاروانی ڕێگە و بان
تولاز و جحێڵی سەر کوچە و شەقامان لاڵ دەکەن
بەهێمای ئەو گڵێنە سەوز و شینانەی لە کوانوی گریکی کۆن دەچێ
گەمارۆی کۆشکە تاق بەرزەکان
بورجەکانی شەڕی جیهانی
گومەزی پیاوچاک و هەم و قەڵایان دەدەن
کۆمەڵێ گەوهەرن لە لیتاوی مێژووی لەبیرچوون چنراون
سامالێ کۆترن لە قەفەزی خەونی ڕاوچیدا تەنراون
ئەم چاخە نهێنی ئاشکرای چەند زۆرە
ئاسکەکان، ئاسکەکانی دۆڵی غوربەت و ڕەوەزی دیاربەکر
تەوێڵیان کاشانی عەجەم و گەردنیان لاملەی ئارارات.
بەکەزی و بسکی لوول و نەرمی زرێبار دەشتایی هەورامان جوان دەکەن.
ئاسکەکان، ئاسکەکانی دڵی دەربەند و سوارەکانی گۆلی مەریوان
شەوەکانیان درێژ... ڕۆژەکانیشیان کورت.



دەوروبەریان بەهەشت نێو دڵیشیان دۆزەخ.
ئاسمانیان بێ مانگ و زەوییان پڕ دیلی
هەر لەگەڵ کازیوەی بەیانێ تا کاتێ خۆرەتاو دەکوژرێ.
بۆ بەختی هەزار جار کوژراوی خۆ دەگرین.
بۆ چرای کوژاوەی عومری بێ سەمەر و جحێڵی خۆ دەگرین.
بۆ ئەو شووشە بەندەی بای چیا و کوێستانیان لێ دەگرێ.
شنەی باڵی مەل و قەتارەی قولێنگان نابیستن.
ئاسکەکان... ئاسکەکانی لە خەم هەڵاتووی
پشت حەوت ناو چیایان.
هەر لەگەڵ کازیوەی بەیانێ تا کاتێ خۆرەتاو ئەکوژرێ.
چیرۆکی دەریاکان، سەربردەی ئەشق و دیلیەتی ئەستۆیان.
بۆ دڵی یەکتری و بۆ سینەی یەکتری و بۆ خەمی یەکتری دەڕێژین
تەوێڵیشیان کاشانی عەجەم و گەردنیان لاملەی ئارارات.
هێندەیان مەمکۆڵە بەئەوین سمیوە
شووشەبەند بۆتە دار هەنارێ لەو دوورە دەسوتێ و هەڵدەچێ
هێندەیان چاوانی ژێر پیاڵەی قەفقاسی بەئەشک ڕشتووە
شووشەبەند بۆتە بەلوورێکی دەریایی و شەپۆلان دەهاوێ.

## نۆستالگیا

ئای جارانم تۆ ئاسکێکی چەند خێرا بووی
برووسکێکی چەند تیژپەڕ بووی
ڕووبارێکی چەند بەپەلە بووی
بەهارێکی چەند کورت بووی
ئێستاش دوای ئەو هەموو ساڵە
شەیدام هەروەکو جاران بم
سپێدان بێ ئەوەی وەکو ئێستا
لە خەو ڕابم و خەمەکانی ڕۆژانەم بژمێرم
یا بۆ کراسی پرسەی هاوسێکانم
هەناسەی سارد هەڵبکێشم
بێ ئەوەی سەرنج دەمە فڕینی مەلان و لە کچانی کۆک ڕامێنم
بێ ئەوەی خەم لەو پیرە هەڵۆیە بخۆم
سەردەمی هاوڕێی ساماڵ بوو
ئێستاکەش دیلی دامێنە
یا دڵخۆش بم بەئەسپ سوارێ
تەرمی دوژمنەکەی بەدوای خۆی پەلکێش دەکا
بێ ئەوەی بیر لەوە بکەمەوە پاش چەند ساتێکی دیکە
چ جەنگێکی بێ ئامان ڕوو دەدا
چەندین تاقانە چاویان دەبێتە شارە مێروولە
شەیدام هەروەکو جاران بم
خۆشترە لەوەی
لە گزینگەوە تا بولێڵ کتێب تەوقی گەردنم بێ
ئای چەند خۆشە ژیان هێندە ئاڵۆز نەبوا
لە نێوان ئێستا و جارانم دەیان هەزار دۆزەخ هەیە



دەیان هەزار کێڵگەی ژەهر و قسەی هەنگوین
ئای جارانم تۆ ئاسکێکی چەند خێرا بووی
برووسکێکی چەند تیژپەڕ بووی
بەهارێکی چەند کورت بووی!





## لوتکە

تۆزێ ئاسمان، تۆزێ زەوی
تۆزێ هامۆنی بەرزە ڕێ
تۆزێ لوتکەی کپ و نەوی
هێندێ مەل و هێندێ تروسکەی سەرشێت
باوەشێ با
مەوادی نەهەنگی هزریان دارماڵی ئازار کردەوە
ئەوە منم دوا سواری پێشەنگ کوژە
گزنگ و ئاسۆ تێکەڵی یەکدی ئەکا
شمشێری ناخی ئەم ناوەی پڕ لە برووسکە کردووە
دیوی زلی چاونخوونی لەت لەت ئەکا
تۆزێ درەخت، تۆزێ هەناسەم پێ دەوێ
تۆزێ سێبەر، تۆزێ خەنجەر
تۆزێ تێڕامان و دامان، تۆزێ ون بوون
خۆهەڵواسین بەدار کاژی سەوزی مەژی
تۆزێ زیندەگیم پێ دەوێ بۆ خودکوژی
نەختێ مەرگ و نەختێ زیندەگی پشکۆبار
تۆزێ خنکان، تۆزێ مەلە و شەختەزانی
لە سینەمدا پشکۆ ڕێژن بۆ هەورازی جاویدانی



## پیری بخور

ئەی پیر
پیری تاک
پیری نەزر
پیری میهر
پیری شەوق کە دیدگا بێ شەوقە
ئەی پیر
پیری شاخ
پیری جوانی
پیری بەزەیی
پیری شریخە و کوانوی ئاگر
ئەی پیر
پیری لاوک
پیری گریان
پیری ئۆخەی
پیری وچان
پیری جەزبە
پیری شکست و سارێژی
پیری پاکی
پیری بخور
پیری شمشێر
پیری ئەزموون
پیری دوای هەموو جەنگەکان
پیری ئەو بایەی لە پاکستانی زەردەشتەوە هێنات
لە مەچەکی خۆتت لوول دا
پیری ئەو تیشکە دوورانەی لە دڵی ئەشکەوتەوە هێنات





له باوەشی خۆت چەپک کرد
پیری ئەو بۆن و بەرامەی لە بەهەشتەوە ڕامت کرد
دونیات پێ کردە ئەفسانە
پیری شان بەر خەمان کەوتوو
پیری دونیا دیدە و جیلوە
ئەی پیری سینە پڕ سەبر
پیری ڕۆحانیەت
پیری خاکی
پیری ڕەونەق کە ڕەنگەکان کەڕوویان گرت
پیری تەم
پیری ئەمەک
ئەی پیری پەرستگای میهر
دەستم بگرە بیناییم ڕەش داگەڕاوە
خەریکە ڕۆحم پڕ دەبێ
لە وردە ژەنگی وەڕسی
لە چڕە دووکەڵی جودایی
دیدگام وا نغرۆ دەبێ
دەستم بگرە تا بتوانم
بەبای لوولدراوی دەستت
بەتیشکی قەفتەبووی سینەت
بەو بەرامەی لە لاسکە گوڵی بەهەشت و
لە جۆگەڵەی شیرت هێنا
هەر بۆ ساتێ حەقیقەتی خۆم ببینم
منیش دەمێ بەو سەبرەوە
بکەومە پاوانی پیران



## هەڵوەرین

(١)

ئەوەتام لە پەنای تەنهایی مانادا
چەند پارچە ڕۆحێکی زۆر سپی
ڕێگەیان لە مەرجان گرتووە
چەند پارچە بابیێکی ڕەوەزان
ئەو ناوەی لە جووڵەی ئەبەدی بەستووە
خەمبارم گوڵەکەم... خەمبارم
خەمی من ڕێ نییە بەسەریا تێپەڕی
خەمی من گوڵ نییە بۆنی کەیت
خەمی من ئاوێنە نییە تۆ کەزی خۆت لە بەریا دابێنی

(٢)

ئەوەتام بەتەنها لە پشت کێوی کتێب
لە پشت گرد و شاخی وشەوە
لە پشت چیای مانای قووڵ
ون بووم و دیار و دیار نیم

(٣)

بوومەتە باران و هەر جارەی دەبارێم و وڵاتێک سەوزەکەم
بوومەتە گوڵە گەنم هەر جارەی دەدرووێم
کێشوەرێک تێر دەکەم
بوومەتە چاوێک و هەر جارەی دەگریێم
دەریاییێک هەناسەی سارد و کپ لێر دەکەم





(٤)

خەمبارم گوڵەکەم... خەمبارم
ئەوەتام لە خەڵوەتگای کپ و تەنهاییم
خۆم لە ڕۆحی سپی نێرڤانا لوول داوە
لەگەڵ چەند چەپکێ باو کۆمەڵی برینما
کارەساتی قەدی درەختان دەنووسین
لە ژێر سای تەوری تیژ
ئازاری گەردنان لە سینگی وشە دادەڕێژین
لە نسێی پەتی نووس

(٥)

خەمی من گوڵ نییە مەیچنە...
خەمی من سێوی بەردەم سیمرغی ڕێ نییە مەیرنە
ڕۆژانە گەڵایێ لە لکم دەوەرێ
ڕۆژانە جۆگەیێ لە گیانم وشک ئەکا
ڕۆژانە پیفۆکێ لە جەستەم دەپشکوێ...

(٦)

ئەوەتا دەشتایی کیانی ونی من
بەتەنهام لە پشت زنجیرە شاخی کتێبان
بەتەنهام لە بەردەم مردنێ چەند سەختە
سەختە وەک ئەو ئەسپەی بەتەنها
لە دەمی هەڵەموت دادەڕمێ ڕۆح نادا
سەختە وەک ئەو ئاسکەی لەرەوگەل دادەبڕێ
بەڵام دەست لە سەمای بەرنادا
سەختە وەک گریانی ئەو دایکەی
بەئەشک سەبووری بۆ دڵی خۆی دەکڕێ.



## بەختەوەرەکانی سەر زەوی

وای چەند بەختەوەرن ئەوانەی
ئێواران کە بازنەی ئاسۆ دەکەوێتە لمی زەوی
دەگەڕێنەوە کوختەکانی خۆیان
زمانیان تامی ڕاستی لێ دێ
دڵیان بۆنی زناری پاکی
دەستەکانیان شەهدی دۆستایەتی لێ دەتکێ...

***

وای ئەوانە چەند بەختەوەرن
هیچ شتێ لە دونیا نازانن
هەمیشە پێدەکەنن... گۆرانی دەڵێن بێ وچان
دڵیان وەکو سامالی سەرچیا سافە
زمانیان تەنها بۆ شەکر دەگەڕێ
دەستەکانیان هەمیشە بۆ ڕامۆسان

***

چەند بەختەوەرن ئەوانەی
ئێواران دەکەونە سەر گازەڵەی پشت
سەیری ئەستێرەکان دەکەن
بێ خەم... پڕ لێکدانەوە و تێڕامان
هەر ئەوەندە دەزانن مانگ
وەک کیژۆڵەیەکی کێوی دێتە نێو باوەشیان
تریفەش دایاندەپۆشێ.

***

وای ئەوانە چەند بەختەوەرن
ئەم زەویە بسوورێ یاخود نەسوورێ
ڕۆژ ٢٤ سەعات بێ یا دەقیقەیێ





فیزیک هەبێ یاخود نەبێ
ئەوانە گۆرانی خۆیان هەر دەڵێن
چونکە بێ گۆرانی دەمرن
دڵیان وەک بەللوری ئەشکەوتان بێگەردە.
زمانیان وەک زمانی کوکوختی بێ گوناهە
دەستەکانیشیان وەک دەستی مەلۆتکە موقەددەسە.

***

وای ئەوانە چەند بەختەوەرن
شەوانە لەگەڵ منداڵەکانیان
حیکایەتی چل تووتی دەگێڕنەوە
گوێ لە مۆسیقای فاگنر ڕاناگرن
خەم بۆ کودێتای ئاو و هەوا ناخۆن
هەر لەگەڵ یەکەم دارژانی ئەستێرەیێ
ئەوانە چوونەتە خەوێکی قورسەوە

***

ئای ئەوانە چەند بەختەوەرن
پێیان وایە ماڵەکەیان سەرەتای دونیایە و دەرگاکەشیان کۆتایی دونیا
وەک ئێمە کتێب ناخوێننەوە
وەک ئێمە بەدێرێک شیعر دونیا لێک نادەنەوە
کە چرایان هەبێ پاشان
چونکە ئەوان هەر لە تاریکی لەزەت وەردەگرن...

***

ئای ئەوانەی چەند بەختەوەرن
خاکێن کە پەنجەیەکیان بریندار دەبێ بەخۆڵ تیماری دەکەن
کە نەخۆش دەکەون بەئاوی دوعا لێ خوێنراو چاک دەبنەوە
کە عەشق لێیان دەدا دەبن بەشوان
دەگەڕێنەوە دەشتایی



دڵیان پاکە وەک ئەو قامیشە دەیژەنن
زمانیان سپی وەک ئەو شیرەی دەیخۆنەوە
خەونیان شیرین وەک ئەو کچەی خۆشیان دەوێ

***

وای ئەوانە چەند بەختەوەرن
بەبزەی گوندینیەک دەیان ساڵ تای عەشق دەیانگرێ
بۆ ئامادەکردنی ڕۆح دەرزی لە جەستەی جنۆکان دەدەن
بۆ ئەوەی نیازیان بێتە دی
بەردی نەزر لە کێلی گۆڕستان دەدەن
ئەوسا دڵنیایی گیانیان دادەگرێ

***

وای ئەوانە چەند بەختەوەرن
ڕۆژنامە بۆ ئەوان کاغەزێکە بەئەنقەست ڕەش کراوەتەوە
بەیەکەوە لەبن دیوارێکی کەلاوە ڕوودەنیشن
پێیان وایە کۆشکی -ذی القرنین-ە
یاری دامە دەکەن
پێیان وایە هاکا دونیا تەواو دەبێ
قۆڵ و باسکیان هەڵدەماڵن
بەرەو پەرستگا دەکەونە ڕێ

***

وای ئەوانە چەند بەختەوەرن
پێیان وایە هەموو کەسێ وەکو خۆیان دڵ سافە
وەکو ئەوان عاشقن
پێیان وایە هەموو کەسێ وەک من ئەوانی خۆش دەوێ

***

وای ئەوانە چەند بەختەوەرن
چەند بەختەوەرن
چەند بەختەوەرن





## تەوقی وشە

فڕینی ئاڵ لە ڕەگ و ڕیشەی درەختی هەتاوایە
فڕینی مەل لە بارستەی شادەماری باڵی دایە
فڕینی خاک لە پەڕ و باڵی پڕ تینی هەڵۆ دایە
فڕینی سامالّی زیوین لە بارانی پەڵە دایە
فڕینی شیعری پڕ هزریش لە ئەفسانەی مەرگ دایە
سووتانی شەو لە شەفەقی ستێر دایە
سووتانی خوێن لە سێبەری دەمارایە
سووتانی کێو لەنێو نرکەی لووتکە دایە
سووتانی ڕۆح لەنێو جەستەی بێ سیمایە
سووتانی دڵ لە کرۆکی ئەوین دایە
سووتانی شیعریش لە دێڕی مەولەوی باری ڕێ دایە
هزری ڕووبار لە شەپۆڵی تووڕە دایە
هزری ئاگر لە هەڵچوونی کڵپە دایە
هزری ئەوین لە سووتانی تەمەن دایە
هزری زەوی لە لەرزشی ناخی دایە
هزری شیعریش لە ترۆپکی مانا دایە



## کتێبی با

- کۆمیدیای با
- هەڵوەشانەوەی با
- کتێبەکانی با
- پیانۆی ڕۆژهەڵات
- کۆچی شمشاڵ
- وەرزێک لە گوناه، وەرزێک لە ئایدیا
- وەک کەنارییەکان هێمن، وەک قەدەر ترسناک

## کۆمیدیای با

با دەپرسێ:
چی بکەم باشە تا میراتگری ئەزەل بم؟
ئەم گەلایانە ڕژاون دەنگیان دێ
هێندێکیان گۆڕی گەوهەر و ژێی ئێسقانن
هێندێکیان بەرخی ساوان
ئەم گەلایانە هەڵدەگرم
سۆمای چاویان داهاتووە
بوونەتە تاوێر لە تاوان
دەیانبەمەوە نێو شەوی ئەو پەریانەی
هەم دیارن و دیار نین
لەوێ دەکەونەوە سەما بۆ سارای سپی دەگەڕێن
هەریەکە و دەپرژێتە سەر ڕۆحی خۆی
هێندێ دەبنەوە باشووکە و بۆ قەلایان هەڵدەکشێن
هێندێ دەچنەوە شەورنی
هێندێ مناڵ، هێندێ پەری
هێندێ دەچنەوە سەر باڵی زەیت ئامێزی میکادۆ
هەر یەک لە کانێ شەرابی ئاسێگە دەخۆنەوە
هێندێکیشیان دەچنەوە بەردەم ئەو شوانەی
زێوەندی گۆڕێکی سپی و پەرژین لە باڵی کۆترە
قژ لە ئەشکەوتان تەڕ دەکەم
من بام بای سیحر ئامێز و ئەفسانە
بۆم هەیە وەک کۆکی گەلا
بچمەوە لەپی دارستان ڕۆح لە باسکم بئاڵێنم
من بام... باش ئەوەندە جادووگێرە
دەکرێ لەنێو سینە و مەمکی پەریان دابکەوتەوە



بۆی هەیە ڕووچێتە نێوان پۆلوە گڕ و کلۆ بەفر
تۆزێ لەسەر پشتی ئەم کۆنە بەفرە دەوەستم
کرمە سووران بێ سنوورە دەلورێنن
دەبێ ئەوانیش بەرمەوە
بیاندەمەوە دەست ئەو ڕۆحەی هەڵیداون
لێرە بوو زریان هەڵی کرد، من فرمێسکی گەلام سڕی
ئەمە بۆ؟ لە سۆنگەی چی وا گریێ و تاس دەمباتەوە
دەزانم ساڵان ئەو وەختە ئەم کۆترە
وەکو دەمە تیغی دەبان ئەو شانانەی منی بڕی
نە دەمی هەبوو نە بەیان
نە گزنگی هەبوو نە ئاسۆ
بەڵام نازانم ئەو سامەی لە کوێی مەمکی
شاردۆتەوە؟
من بام... با، ئەو گەلایانە هەڵدەگرم
دەیانبەمەوە سەر کەوری هەزار دەرزی شای پەریان
دەردەکەون دەرناکەون
ئەلەوێدا سەما دەکەن
دەیانبینم... هێندێکیان لێ دەناسمەوە
ئەوە هەورێکی سورمەیی لەسەر ناوە چل کەزیبیە
بەڵام نازانم بۆ دەگری؟
ئەوەی تریان – دیونیسی–یە بەم ناوەختە
کەللەسەری لە لەش جیا ئامێزی خۆی گرتۆتە دەست
پیاسە دەکا
ئای ئەم پیاسەیە چەند سەختە!
گوێم لە بالۆرەییێکی دوورە بۆ هەڵ نەکەم
لە ئامێزی خۆمیان بکەم

هێندێکم پێیە هەنسکی سەمای کەوکازی تێدایە
هێندێکم پێیە لە ئەشکی کۆنە شاکان وەرپێچراوە
هێندێ کەمەریان گرتوومە
سێڵی دەروونی –پروتوسن– لێیان بێزارم
ئەمانەش کە بەسەر شانمەوە تورکاون
زرەبان لە مژاد کەوتوونەوە
ئەمەشیان مەلهای شالیرە
پەرەسێلکە و کۆردیلیا بەیەکەوە گۆرانی دەڵێن
من بام... با
ئەوە تۆی خۆت لە قژی من ئاڵاندووە
ئای پەریخان چاوت لە ئاسمان دووری بوو
باوەڕ ناکەم زەویت بەقەد پاژنەی منداڵێکی ساوا بینیبێ
ئای کە بچووک بوویتەوە!
سەرسامم
تۆ بەقەدی ئەو کەونە بچووک کەمەوە
یا ئەم کەونە بەقەد تۆ گەورە کەم!؟



## هەڵوەشانەوەی با

چی دەبێ زێ هەڵکا و ئاگر لە کێڵگەکان بەربدا
چی دەبێ گەر ئاور نێڵە داوەرێنێ و کلۆکۆی تەڕاتی چیا دامرکێنێ
ئەسپی شەو چوار ناڵە تاو بدا و ئەشکەوتان دیلی دەست و قژی چرا کا
ئەم ڕێیە چەند سەختە بێو لە پاوانی شین بئاڵێ
بکرایە بچێتە نێو فەریکی وشە و لە زەمین بەربوایە
ئەوساکە دەمتوانی قەفتی پانوپۆڕی بگرمە دەستم و
لە مێرابی ڕۆحم گیر بوایە
«ئەم ڕێیە چەند ئاڵە با هەڵوەرێنێ
کەون تاریک دادێ، ئاسمانیش تەنگ دەبێ
باشوکەی قەڵایان تۆیان دەبرێتەوە
کۆڕەوی قولّینگان بەم ناوە ڕەت نابێ
ئاسمانی ژێر پێمان دەبێتە زەنەکی ئێسقان و بەگوڕێ وەردەبێن»
ئەمە بای دۆزەخی سەر بەفرە و لەمێژە سایەدن هەڵدەکا
بکرایە لە ئاڵتوونی بنێم، دەستم لە گەردەنی لوول دابا
بکرایە سواری سەر پشتی پڕ نهێنی بوومایە
دەستم لە ئاورینگی سوور دەکرد
تا پەری یاقوتبەندی ئەودیوی کەونم دیبایە
لەمێژە سایەدم هەڵ دەکا
«هەوێردە نابینم، غەرەبەرد دەرمێن
کەند و لەند نامێنن، تخوب و تەپۆڵکە ساف دەبن
پشیلە و ڕەشەمە لە ئاستی یەکتری ناچەمێن.»
سایەدەم وا باران هەڵ دەکا منارەی سپی جێ دەهێڵێ
چی دەبێ کۆتایی بەئەوینی دەمی ئەو تەورە و ڕۆحی خۆم بهێنم
وا هاتن سەرای کۆچی ئەوان مەلانەی لەسەر بەفرەوە ڕا بزووتن

عەتری هەور و زریان بەشووشەی دەنووکیان دەفرۆشن
خەیاڵی دوندی دووریان پێیە بەشەققەی شاباڵی هەڵۆیان دەخوێنن
بەچەقۆی زمانی ئەشکەوتان چەمی شاعیرەکان دەدوێنن
هەناسەی کەمتیاری ئەبەدە بەسەر تاڵە ڕێی ڕۆح هەڵ دەکا
سایەدم کرمە بەفری لووتکە لورەی دێ و دۆڵەکان دەهەژێن
-سیمرغ- پەڕیان هاوێشت
کەوتوونە کفکفەی بورکانی لە مێژینەی دامێن
چی دەبێ زێ هەڵکا بەر لە لافاو بگرێ نەهێڵێ خەڵفەکان بخنکێن
چی دەبێ دۆکەڵ لە گڕ بەربێ و نێڵە دامرکێنێ
پاییز بێتە ڕایێ و زیوی زەرد بۆ دار کاژ باتەوە
مەرگ گیان بەبیابانی لەشی کوژراوە داتەوە
ئەم ڕێیە چەند لە شووشە دەکا دەڵێی مەرجانی ناو دەریایە
بکرایە ببێتە خەناوکە یا گلێنەی ماسی
ئەوساکە دەمکردە ئارموش و کریستاڵ لە ڕۆحم دەئالاند
کە ئێستا دەڵێی نەخشەی گشتی دونیایە
یەک ملیۆن هێڵی خوار و خێچ و گوند و شار و چیا و تونێڵی تێدایە
ئەم ڕێیە چەند لە شووشە دەکا تەم بەسەریا هەڵکا
«دونیا وەک ئەڵماسی بەفر هەڵدەگەڕێ
هەناسە تەنگ دەبێ، مەلی نێو دەشتایی کۆچ دەکەن
بارانێ دەبارێ لە بازرقەی تۆوی پیاو دەچێ
مۆرانەی بێ دەنگی بەم ناوە وەردەبێ
دەروونمان دەبێتە چلوورە»
زێڕ و زیو ڕووکراوە - قەندیلی هێمنیم کوژاوە دەریاوان-
ئەمە بای دۆزەخی سەر بەفرە ڕوومەتی دەروونم قاوە دەدا
ئاسکی پەنجەرەی بەر بارانی جەنگەڵان دەسمێ
بکرایە لە خوێنی خۆمی دابڕێژم، ئەسپێکم لە سیمای زین دابا





چووبامە نێو پاشۆڵی پری، سەرم لە پرووسەی پیر دەکرد
تا بەسرکە گێژانی سینەم
ڕیشی ئەم هەبوونەم لە ڕەگ و بێخەوە تاشیبا
لەمێژە سایەدم هەڵ دەکا
«سەقر و باز دیار نین، لورەی گورگی چیا نابیستم
ئەشکەوت کوێر بووینەوە قەرسیلیش خوناوە دەرنادا
بزن و کاریش لێک هاوێر ناکرێن»
سایەدم وا ئاسمان کرێوە دەکاتن
تخوبی نێوان کوللەی بەفر و ئەم هەورە کفنییە نابینم
چی دەبێ سەرەتا بۆ خەرەندی ڕۆحم دارێژم
وا ڕەتبوون کۆتایی ئەو مەلانەی لە با چەقیون
پشکۆ و سکڵ و پۆلی بەمینای چاو دەکرن
هەواڵی بەفرێکی ئەستووریان لە بارە و
بەشینی کەناچە و کوکوختی دەگرێین
بەلۆکەی سەرپەشتی شاخەکان برینی شاعیران دەسووێنن
مەرگی ئاڵەکۆکی ئەبەدە بەسەر ئاڵەڕێی ڕۆح هەڵ دەکا
سایەدم ڕێگە و با تێکەڵ بوون، مانگ گیرا
«کەحێل ژان دەیگرێ
چیاکان چیتر نابنە گوڵتەی بەر پشتی ئەم کەونە
تەنگەی ئەم زەوییە بەناو لەپ دەگێڕن
شل و پەیتی دەکەن»
ئەستێرە بەکۆمەڵ دارژان
بێ دەنگی و ئەم کەونە تێکەڵ بوون تێک قژان

تێبینی:

– ئەو دێرانەی کە لەنێو کەوان دان نەویدی ڕووداو دەبەخشن کە خوێنەر لە درامای هۆنراوەکە بێدار دەکەنەوە. جا ئەگەر ڕووداوەکان لە ئاستی دەستپێکردن و گێڕمە و کێشە و کۆتایی هاتن نەبن ئەوە هەرگیز لە بنچینەی درامای هۆنراوە کەم ناکەنەوە. جا ئەو دێرانە نیشانەی دەستپێکردنی ڕووداوەکانن کە خوێنەر لە کاتی خوێندنەوەدا پەیان پێ دەبات.

– ئەو دێرە کە لە نێوان دوو داش دایە و وەرگیراوە.

– دێری –سیمرغ...، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شتانەی کە زێتر لە میتۆلۆژیای ڕۆژهەڵاتەوە بەتایبەت هی کوردیدا هەن. دەڵێن گوایە ئەو پەڕە باریک و تیژانەی سیمرغ دەیهاوێت و لە خۆی دەترازێنی، نیشانەی بارێکی نالەباری دەوروپشتە یا هی خودی –سیمرغ– دێری –زێڕ و زیو...، بارانێ دادەکا و...، سەر بەمیتۆلۆژیای کوردین، من لە خزمەتی ڕووداوەکانم بەکارهێناون.

– ژان گرتنیماینێ کەحێل لە کوردەواریدا حاڵەتێکی ئاسایی نییە.

– بزن و کار لێک...، پشیلە و ڕەشەمە...، دووبارە پەیوەستێکە بۆ لە بن نەچوونی ئەو حاڵەتە نائاساییەی لە هۆنراوەکەدا باس دەکرێت.



## کتێبەکانی با

(١)

ئێوارە بوو کە جێی هێشتم ئەفسانەیی
دڵێکی شووشەیی
خوێنێکی قەفقاسی
هەندێ عەتر و قەیرێ ئەشک
ڕۆحێ لە سپیاتی بەفر و تەتەرێ لە جوانی
بەیانی بوو کە هاتەوە
ئەسپێکی سورخن و بریندار
بخورێکی ئاسمانی و تابووتێکی ئەرخەوانی

(٢)

ئێوارە بوو کە جێی هێشتم
مشتێ ئاوازی کێویلە
باوەشی بای نێو ژوورەکانی بەهەشت و
دوو نوکتەی خۆش
دیشلەمەیێک
دەستێ پڕ لە میهر و
ئەشقێکی نەرسۆسی یەکجار ئاڵ
بەیانی بوو کە هاتەوە
کراسێکی ئەبەنووسی
تەرمێکی گوڵ گوڵ و
سرووتێکی جەنازەیی

(٣)

ئێستێکە لە خۆشی پێشوازیت
بخورێکی شامیانە دادەگیرسێنم

ئاگرێکی زەردەشتیانە دەکەمەوە
مۆمێک لە عەنبەر
کتێبەکەی زۆربا دەدەمە بەر دڵم
لە پەری یەکەمەوە
گریانێکی قووڵ... خەمێکی تیر
حەسرەتێکی پەمەیی دامدەگرێ
چ مەلێکی موقەددەس بوو
باڵی گرت و لە ئاسمان سووتا
چ پەرییەکی ئەفسانەیی بوو
تەمەنی لێ داگیر کردم
ئای لەم خەڵوەتە ئەبەدییە

(٤)

ئێستێکە لە پێشوازیتا
چەپکی با ڕام دەکەم
تووڕەیی ئەسپێکی کێویلە
دەکەمە نێو شووشەی شەرابێکی خەست و کۆنینە
کتێبەکەی –سیلونە–
ئای – نان و شەراب
لە بەشی یەکەمدا
چەمە ئاڵەکانی جەستە و
مەلەی پڕ لە شەبەقی من
ئاسۆ دادەگرن
کەمتیاری چ گوناهێکە
دڵی مناڵیمی دیل کردووە
چەقۆی چ ژەهرێکە لە دەستی پرۆتوس



(٥)

لە ماڵاواییتا
لەبەر چراێکی غەریبانە
لە پەنای خانووێکی جزیری
لە بەردەم پەیکەری هەرماسا
بالوورەییێک
فرمێسکێکی خەمبار
«یەک کاسە گەنم دەڕێژم»
کتێبەکەی مەولەوی دەکەمەوە
چ ئاگردانێکی پڕ تقوس بوو
لە باڵی فریشتەییم بەربوو
چ بوراقێکی خەمەنگیز بوو
لە سەفای ئەو دڵەم پەڕی
ئای لەم خەڵوەتە ئەبەدییە

## پیانۆی ڕۆژهەڵات

بای ئەشقیا چەند شێتە
هەر دەڵێی خوی بەجوانییەوە گرتووە
لە چاوقوچانێکا پالتۆکەی بروسکی لەبەرکرد
کتێبەکانی ژێر هەنگڵی ڕێنواری فڕاند
تابلۆکانیشی بەسەر درەخت و گەڵادا بەشیەوە
با دەروون ناخوێنێتەوە
تەنیا بەدوای جوانیەکاندا دەگەڕێ
جار جارەش دارستانەکان لە گیرفانی خۆی دەنێت
دەیانبەخشێ بەلافاو
ڕێنواریش هەمیشە وەستاوە
گۆچانەکەی لە زەوی گیر کردووە
چاوێلکەکەشی تەمی بولێڵ داپۆشیوە
بەڕامانەوە سەیری فەرتەنەی با دەکا
بە بزەییێکەوە دەڵێ
بای سەر ئەو گۆڕانە هەر دەڵێی تەمتومانێکە لە گومان
کتێبەکانی تەواو کردم و تۆم هەر نەبینی ئەی دۆست
بێ تۆ ڕۆژهەڵات خاڵیە و بۆنی فیراق
چ شتێ سەختترە لە تەواوکردنی حەرفێ
بۆ فەریکترین پرسیار و ئەشقیاترین ئەشقیا
بۆ من ڕۆژهەڵات
بەتەنیا فاتیمە و تاقە بەرزەکانی بوزای لێ بوو
فاتیمەش وەکو ئەفسانە... وەکو با
چاوێکی دابوو بەئاشقەکانی سەر زەمین و
چاوەکەی تریشی دابوو بەپەریەکانی ئاسمان
دەستێکی لە شانی گومانەکانی هاملێت و



دەستەکەی تریشی نابووە سەر شانی خلود
ئەوە تابلۆکانم... سەیرکە بەر کێ کەوتوون!
درەختێکی شکاوی سەر کەنار
کەناچە و نەوڕەسێکی زۆر
بەسەر تەرمەکەیا وەستاون
سەیری ئەو دووکەڵە لە کۆختێکی تەنیا
ڕەوە چۆلەکەیێ لە ساماڵ سەما دەکەن
با دەروون ناخوێنێتەوە
تەنیا موریدی ئایینی جوانیە
ئاوڕ لە ڕێنوار داتەوە
گیانی پڕ دەبێ لە گریان
چانییە ئاوڕ ناداتەوە
با ئاوڕ ناداتەوە ڕێنوار... ئاوڕ ناداتەوە نا... نا
بۆ تۆ ڕۆژهەڵات بەتەنیا
فاتیمە و تاقە بەرزەکانی بوزای لێ بوو
کەچی بوزاش وەک حەقیقەتی زەیتی تۆ
دەستێکی بۆ ڕامانی جەنگەڵەکانی کەشمیر بوو
دەستێکیشی مەرحەمەت بوو بۆ قوتبەکان
چاوێکی خستبووە سەر خەڵوەتەکانی ڕۆحانی و
ئەوی دیکەشی یۆگای ئازارەکانی سەر زەمین
بەفر دەبارێ
وەک لاولاو بەگۆچانەکەی ڕێنوار هەڵ دەگەڕێ
لە حەسرەتی هێڵکاری بادان و ترێی چاوی کچان و دەنگی گەواڵە
هەناسە ساردەکانی -عەبدوڵڵا ڕەسووڵ- سڕبوون
کە ئێستا لە کونجێکی دوکەڵ گرتووی لەندەنا
بۆ باوڵە تەنیاکەی ژووری تەیراوە دەگرییێ





که پڕن له کتێبی نایاب و فرمێسکەکانی دایکی
تەماشا کە ئەی با
ئەوە چ فەرتەنەیەکی جوانیت نایەوە؟
سنوورەکانت تێکشکاند
ڕەنگەکانت تێکەڵ کرد
ڕێنوار سەیری با دەکا لەناو پاڵتۆکەی برووسکا:
فاتیمە ئەی ئەمیرە جوانەکەم
ئەمیری هەموو ڕۆژهەڵات
بوزا ئەی پادشای حەکیمەکەم
ڕۆحانیترین ئەشقیا
ڕۆژهەڵات بۆ من گوڵە گەنمی داسەکەی دەستی بوزا بوو
مارکس ئەو کاتە مناڵێکی هەرزەکار بوو
لە باخەکانی -باخ- و لە میترۆکانی -هێگل-دا
فەریکی دەچنی و خەریکی ڕووخاندنی
کۆشکە جوانەکانی -میداس- بوو
ئەو کاتە منیش شەوێکم لە سەدەی نۆزدەهەمدا
بەدیار پیربوونی میدیا و
مناڵیشم لەگەڵ جوانیەکانی سێندرێلا بەسەر دەبرد
سروودی کۆنینە و گۆرانی قەدیمەم کۆ دەکردەوە
فاتیمەش کە ئەمیری جوانەکانی ڕۆژهەڵات بوو
لە وڵاتی نوور
لەسەر مەرقەدەکانی بخور هێند دوور بوو
نە دەستی فەلسەفە دەیگەیشتێ و
نە عیشق دەرسی سووتانی پێ دەبەخشی
گۆڕە موقەددەسەکانی ڕۆژهەڵات وە ئاگا هاتن
مەعبەدە پڕ بخورەکان زەنگیان لێدا



ئای بای عەشقیا ئەوە من بۆ کوێ دەچم؟
نۆڤالیس دوای تەواوبوونی ئەم دوو دێڕە مرد
منیش دوای فڕێدانی کتێبەکەم
لە ئاگردانی زارادا
ئێستاکەش چل ساڵم
چل جاران کەوتووم و ڕماوم
هەر جارەی چل پەنجەم لە داخی ڕۆژهەڵات تەقیوە
هەر پەنجە و هەزاران برینی مێژووی لێزاوە
بۆ منیش ڕۆژهەڵات فاتیمە سونبولی خاکێکە
چل ساڵە لە چاوەڕوانیدا.
کراسی مەحاڵی لەبەردا
بوزاش سوارێکە هەمیشە و هەمیشە بەتەنیا
هەر ڕۆژە و چل جاران ئەی بای شێت
پرسیاری نۆڤالیس دەمکوژێ
هەر جارەی چل شووشە لە خوێنی کاستالیام پڕاوە
دەزانم سەفەری دەریای مانگ دەمکوژێ
ئێستاکە چل ساڵم چل کەڕەت بەو شانەم
بەردەکەی ئومێدم بردۆتە ڕۆژهەڵات
چل کەڕەت بەردی من لە لووتکەی دێراوە
ئەی دوورگەی پەپوولە و ئاگردان
کەوتوومە بەر بایێ دەروون ناخوێنێتەوە
خەریکی ئایینی جوانییە
هەر کەڕەت چل هامۆن ئارەقم ڕشتووە
کوانێ نوور لە چاوی پڕ ئەشکی فاتیمە
کوا بخوور لە بڕی ئەسپەکەی بوزادا؟
ئێستاکەش لەبەر بای ئەو گۆڕە دوورانە





چل هەزار دێڕی خوێنم پێیە بۆ تابلۆ
چل تەغار ئەشکەنجەی ڕۆحیشم
لەبەر پێی ئومێدت دەنێژم
باش کتێبی فڕاندم ئەی دۆست، بەڵام تۆم نەبینی
بۆ منیش ڕۆژهەڵات فاتیمە و بوزابوو
مەعبەدی پیرۆزی ڕمان بوو
گۆڕستانی نوور و یەقینی خەمگینی و نەمان بوو
با دەروون جێ دێڵێ و ئاییینی جوانی تەی دەکا
بەفر دەبارێ
ئاخر ناکرێ لەگەڵ بەفر عینادی بکەین
کە بگاتە نێو قەدی ڕێنوار
دەتوانێ تا پای ئاسمان خۆی فەرز کا
ڕێنواریش وەستاوە و
هەر سەیری ڤیگەری خۆی دەکا
کە با لە پاڵتۆی بروسکا هەموویانی بەشیەوە
ئەو ناوە غەرقی غوربەت و سەدای پیانۆیە
پیانۆیێ لە ئاو
پیانۆیێ لە با
پیانۆیێ لە بەفر
نۆتەییێکی بۆ گریان فەرموون بۆ ئەوەی جوانی هەبێ ئێوە بگرین
نۆتەییێکی بۆ سەما فەرموون بۆ ئەوەی نەوڕەس هەبێ سەما کەن
نۆتەییێکی بۆ گۆرانی فەرموون با وەڕسی نەمامکوژێ گۆرانی بلێین
نۆتەییێکی بۆ باخوس فەرموون بۆ ئەوەی ئاهەنگ هەبێ بخۆنەوە
نۆتەییێکی بۆ ڕێنوار بۆ ئەوەی خلود هەبێ ئێوە ڕەنگ برێژن
بایێ لە ئەبەد
بایێ لە پیانۆ



بایێ لە ئاو
شنەییێکی بۆ بەشینەوەی جوانییەکان
نەبادا لە هیچی بمرین
شنەییێکی بۆ گواستنەوەی پێشانگای ڕێنوار
نەبادا کەسێ مەحرووم بێ
شنەییێکی بۆ بەرگەی ژیان
نەبادا وەڕسێ بمانکوژێ
لافاوێ لە ژاڵە
لافاوێ لە ژەهر
شەپۆلێکی بۆ سادیەت
شەپۆلێکی بۆ ڕمان
پیانۆ
با
لافاو
پیانۆ بۆ باڵێ بۆ خاتری گۆڕی عاشقان
با دەروون ناخوێنێتەوە
بەدوای جوانی دەگەڕێ
لافاو بۆ نائومێدی ڕێنوار
بەفریش هەروا دەبارێ
چاوێلکەکەی ڕێنوار تێکەڵی بەستەڵەک بوو
تابلۆکانیشی لە دەستی پۆستەچی با دایە
هەموو شارەکانی دنیا دەگەڕێ
ئەوە بای ئەشقیا بوو
لە پاڵتۆکەی برووسکا هەڵی کرد
کتێبەکانی بن هەنگڵی ڕۆژهەڵاتی فڕاند

١٩٩٨

## کۆچی شمشاڵ

هاتیتەوە ئەوەتا
نە درەختەکەی دایکم گوڵی گرت
نە من لەبەر بارانی مەولانا
فێری مەزموری داود بووم
نە تۆش لە بەندەری مەنفا
خەونەکانی خۆت هێناوە
ئێستا بەسینەی کون کون و ڕووخساری تەم
لەبەر پەنجەرەی مناڵی هاوار دەکەم
ئاخر تەرمی سەرپشتی ئەو ئەسپە کەرەندیانە
ئەوەتا شمشاڵەکانیان لەلای من جێهێشتووە
چ زوو چ زوو گەڵای ئاوازتان هەڵوەری
ئەوە چ زەمانێکی سەختە
سەرێ نابینم لە تەوقی پاییز ڕەها بێ
مەلەکان ورنەوە
ژێر سواندەکانی مناڵیم چۆڵ و هۆڵن
وەرنەوە با بچینەوە بەندەری سەفا
لەوێ بەسەر باڵی باراندا
دەچینەوە ئاسمانی جاران
لەوێ درەختی عەتری مەولانا
دەپرژێتە سەر پەنجەران
دڵمان دەبێتە عەترستان
هەوێردەکان خۆیان لە ئاوی حەیاتدا
جێیان هێشتین
با بچینەوە سەر ئەو تاوێرە بەردانەی
هێشتا فرمێسکی یای زینێ





شەوقی خۆیان دەدەنەوە پیرە بەندەنێ
ئەلێرە شمشاڵ نەماوە
قامێشەلان سەوز نابێ
دەنگ خۆشەکان باریان کرد
بەللوری دوا گۆرانی خۆیان هەڵوەراند
وەرە با بچینەوە سەفەری سەفا
لە سێبەری ئەو کاژانەی
لە ئەفسانەی عیشق چەقیون
بەندی گریان بلێیینەوە
ئاخ لە منێ... ئاخ لە تۆیێ
لەبەر پەنجەرەی مناڵی هاوار دەکەم
ئەوە چ زەمانێکی سەختە
لە من و لە پیرە هەڵۆیێ
گۆڕەکانمان هێندە زۆربوون
گوڵ لەسەر گۆڕی کێ دانێین
پرسە بۆ کام مەلی تەریوە بگێڕین
ئاخ لە منێ... ئاخ لە تۆیێ
نە درەختەکەی دایکم گوڵی گرت
نە من لەبەر بارانی مەولانا
فێری مەزموری داود بووم
نە تۆش لە بەندەری مەنفا
خەونەکانی خۆت هێناوە
ئەوە چ زەمانێکی سەختە
شەکەت بووین...
وەک دڵۆپی شەونمی دار کاژی چیایان
ئەو بەستە وەک ژەهرە دەچڕین

مسۆگەر دەزانین بۆ مەرگە
کەوتووینە سەر زەمین لەت لەت بووین
ئاسمان پڕبوو لە ترووسکەی لەشکر و بrووسکەی شەمشێران
هەر سوارە و لە تۆزی شەڕی توش
خڵتانی خوێن دەبێ
هەر ئەسپی سورخنە و کوڕژنی پڕ سامە
ئەو ناوە دادەگرێ
هەر تەرمە و گەردنیان
وەک کوانوی زستانی قەیسەریان سوور دەچێ.



## وەرزێک لە گوناھ، وەرزێک لە ئایدیا

حیکمەتی مەستی بوو یا عیبرەتی ئاگاهی
لەشکری نەوڕەس و فریشتە پێکەوە
چوونەوە قەفەزی ئازادی و خۆیان کوشت
بەرلەوەی لە چەمکی جورئەت و
شمشێری هەق بگەن
تەیرەکان لە سامی ئەسپە دۆمیەکانی تەروادە
یەک یەکە خۆیان لە خەرەندان هاوێشت و
باریان کرد
فەزاییێک کەناری
ئاسمانێک لە عاج و سەدەفی سوڵتانی
کیشوەرێک لە فیردەوس
لە کۆشکە تەنگ و تارەکانی ڕۆژهەڵات
دوای ئاوابوونی خۆر
چوونەوە ناو ماڵی شووشەیێ یەئسی تاڵ
پیرۆزەی باران و قەدیفەی ڕۆحیان
بوو بەتەم بەسەر پەنجەرەکانی سەر زەوی
تەوقێکی ژەهر ڕێژ
جەللادی وەڕسی وەک گەڵا
ڕژانە نێو سینە و مەمکی زۆر زۆر سپی
لەو دیلانەی کەوا جەستەیان لە ڕەحم و ڤیانە
دڵیشیان لە ئاوی کەوسەرێ
هێشتاکە زۆر زووە بتوانین
لەبەر قاپی خەون بوەستین
قەدرێ یۆتۆپیا و کۆمارێ مەستیمان پێ بەخشێ

حیکمەتێکی قورسە پرسیار
سەفەرم خوی پێوە گرتووە
لە ژێریا پشتم و هەزاران کتێب کوڕ بۆتەوە
لە دوورەوە حەوزێ لە هود هود و
بستە خاکێ لە نوور
دوورگەیێ لە هەرماسی سپی ڤاوستی
سەرابە سەراب نییە
کەنارێ ڕووت و قووت
لە جەستە شەونمیەکانی ئەو دیوی قیامەت
مەمکیان چرای سەر زەمینە
فەلسەفەیان تێکەڵبوونی سەدەفی هەوەس و
ئەبەنووسی داوێنیانە
نەمتوانی سەفەرم دوابخەم
بۆ مەملەکەتی خزین بەسەر ئەو جەستە نیلۆفەریانەی
وا لە تەک ئاگری دەروونیان
لە جەنگی سوهاقی شەربەتی شەهادەت دەنۆشن
پاڵەوانەکانیش شەمشێریان سڕبووە
ئێستاکە لە میانی گریان و سەفەردا
تەنێکم شەلاڵی عەزاب و تاوسی ڕەوحانی
مێوانم لە کۆشکە تاق بەرزەکانی عیرفانەوە
ڕاهاتووم
گەرەکمە فریشتەییم بەتاڵ کەم
جلی ئەو حیکمەتە فڕێدەم
تازە ناتوانم من وەک جاران
لە بنار بەرزەخی قەدەرا
کەون بخەمە ناو لەپی شعور و ڕامێنم



ناتوانم وەک جاران کتێبی پەندە پاراوەکان لە ئامێز بگرم و
نەچمەوە ئاپۆڕەی بۆرسەیێ
جارِی جەستە دەدا
تەڵەبی شەمشێرێ لە ئیرۆسییم دەکا
سەرابە و سەراب نییە
چەند دوورە بتوانم ئەو هەموو سینە پان و سافە
لە شیری خلودێ غەرق کەم
لەوێدا لەنێو ئەو مەتهەرە نوورانیە
دیلێتی بەتەنها کەمەندی گەردنە
مەستیشمان لە شووشە شەرابی شەفەقێ
هێشتاکە زۆر زووە بتوانم
من دەقی زمانی ئەو سیحرەم دارِێژم
با بگەمە کۆماری ئەندێشە و ڕازیانەی
گومانم بداتێ
ئەوەتا لە حەپسە دوورەکانی دەروون
کە سەدان نێرڤانای شیعری لێ دیل کردووم
بۆ ڕێگای سەفەرم بانگ دەکەن
ئەو سەری دۆستێکی دێرینی مەحاڵە
ئێستاکە درەنگە ناتوانم
لە ورد و خاش بوونی خۆم خۆش بم
ناتوانم وەک جاران
دیشلەمەی ئاگاهی ئاوا کەم
حیکمەتی مەستی بوو یا پابەندی میسال
ڕووخساری تەمگرتووی مەستەکان
بەسەر ئەو مێزانەوە جێماون
بەر لە من چوون بۆ ئەو سەفەری مەحاڵە





بوتڵیان خاڵی کرد له شەڕی جوانی
ئەوێستاش درەنگە و سەفەری خۆش نەما
کاتیشمان بەسەرچوو
تا لەگەڵ ئایدیا چەند شەکرێ بشکێنین
ئەم دەقەش تەواوکەین.



## وەک کەنارییەکان هێمن وەک قەدەر ترسناک

گوڵە هەڵوژەیێ لەژێر باران سەما دەکا
قەدەر گۆرانی بۆ دەڵێ و شمشێر بڕستی پێ دەدا
ئەم جاویدانییە چەند سەختە
کیژۆڵانی نێو کتێبی باران و با هاتوونە دەر
خۆیان لەبەر تیشکی هەوەس دەشۆنەوە
ئەمە یاقوتە هەڵڕژاوە لە پەنا سەمای هەڵوژە
یا جوانێکانی قەدەرە بەسەر ئەم کەونە پژاوە؟
با لەمێژە هاوسێیانە و لە چاویانا دابڕاوە
بەدوای میدیای خۆی دەگەڕێ...
دەیانباتەوە بەرزایی
لەنێو پرچ و سینەیاندا لانە دەکا
ئێستاکە سەعات چوارە «کاتێکی خۆشە بۆ مردن»
گوڵە هەڵوژەیێ لەژێر باران سەما دەکا
یاری بەقەدەری خۆی و شاعیر دەکا
دایکێک دەستی کۆرپەکەی خۆی گرتووە و بەرەو مەملەکەتی هەڵم دەچێ
دار کاژێک شریخەی شکانی دەدا بەچیا
دڵنیام تەزووی گلانی سوارەکانی بەجەستەدا هاتووە
کچێ کە تازە بەساماڵی پاییزی ڕووی هەڵگرتووە
بەرهەڵبێنەکەی لە شووشەی ئەستێرە شکاوەکانە
لەبەر پەنجەرەکەی کە دەڕوانێتە غیلمانەکانی بەهەشت
گۆرانی بۆ عاشقەکەی خۆی دەچڕێ...
سەد ساڵە چاوەڕێی دەکا
دڵنیابە خۆی و ئەسپەکەی دێنەوە
جەستەیان بۆتە شەباقە و گوڵی دەشتاییەکانی جەنگ

ئاسمان ئەمڕۆکە تووڕەییە ڕەنگە خەتاکەی هی من بێ
نەچووم بزانم ئەو هاوارە کە لە جەستەی عیشق خولّقاوە
کام دامێنە شاخی هەڵدڕی
نەمکرد بچم بەلای ئەو هەنارە سوورەی لە بەرزترین لکی دارەوە
لە باڵای ساماڵ شەق دەبا
ڕەنگە خەتاکە لە من بێ...
ڕەوە ئەسپێ لەو گردە هاتنە خوارەوە و خەرەند قووتی دان
من غەرقی سەفا بووبووم نەمزانی ڕامیان کەم
ئێستاش ون بوون
کورژنی برووسکەدارییان بۆتە شمشێر مانگیان شەق کرد
من نەبووم... نا ئەوە ئەو شۆڕە بییانەن پرچیان
شۆڕ کردۆتەوە سەر لێوار ورد ورد خۆیان رووت دەکەنەوە
من نەبووم... نا شەوقی هەسارەکانی دڵم بوون
بەدیار سەمای گوڵە هەڵوژەکان
ئەو ناوەیان دابووە دەست زیوینی قەدەر
خودایە ئەمڕۆکە چەندین عاشق مەستن و گۆرانی دەڵێن
دەبن بەگەڵا دەوەرن...
ئەمە درێژترین وەرزی سەمایە
هەور چەند بەتووڕەیی هەواری ئەم کێڵگانە دەسمێ
هەسپ سوارێک تیژتر لە برووسک
شەفەقی خستۆتە سەر شان
وردە وردە خەونەکانی لێ دەرژێ و دەبنە مەرجان
لە دواوەی خۆی دارستانەکانی پڕ تووڕەیی کردووە
دەبێ شریخەی ئەو دار کاژە
کام خەونی ڕژاوی ئەو سوارە بێ... خۆی دەکوژێ
ئەو ناوەی کردووە بەدۆزەخ



دەبێ چ دڵێکی تەژی لە عەشق بووبێ
ئاوا بەر چاومی لە شەفەقی فرمێسک گرتووە
نا... نا بێ هودە نییە، نا ئەزیزم
ئەو گوڵە هەڵوژەیە سەمایەکی وا مەرگاوی بەلەش دەکا
دەنگێ نابیسم
چرایێ دوور دوور دەسووتێ و دەشنێتەوە
ئەوە دەبێ کولبەی ئەو پیاوە پیرە بێ کە پێش تەمەنی خۆی
کەوتووە
هەموو ڕۆژێ بەگۆچانێکی شووشەیی و
ڕیشێکی نوورانی بەم ناوە گوزەر دەکا
هەموو ڕووناکییەکان دەگەڵ خۆی دەبا
دەبێ ئەو بێ... ئا دەبێ ئەو بێ
ئای چ پیرێکی ڕەهەند و موغانییە
ئاسۆ لە گازەڵەی پشتییەوە هەڵدێ
کەنارییەکان خۆیان لە لمی کەنار وەردەدەن
ئەو ناوە دەکەن بەکەنارستان
ئەمە نهێنییە و تەنها با پێیان دەزانێ... با
شمشاڵی فڕینیان دەژەنێ...
ئەمە نهێنییە و تەنها با دەزانێ با
کە لە سەمای گوڵەوە هەڵەچێ
لێرەوە هات... کە هات بەهار لە دەم و چاویا سەوز بوو
ها ئەوەتا دەچێتەوە، کەچی بەفر عومری سپی سپی کردووە
ئەمە چ تاسەیێکی ئەبەدی بوو
لۆچ و تەڵخی سەدان ساڵی پێوە دیاربوو
دەبێ چ کارەساتێ دایماڵیبێ
با دەیزانێ، با، بینیم کە هەڵی کرد





هەموو گیانی لە سوورخنی شەلاڵ بووبوو
دەبێ چ کۆستێ دڵی ئەنگوا بێ...
با دەیزانی... با ، دەیان مەستی پڕ لە سەفای هەڵگرتبوو
گوڵە هەڵوژەیێ لەژێر باراندا سەما دەکا
قەدەر گۆرانی بۆ دەڵێ و
مەرگ باوەشی پێ دەبەخشێ
ئەی با... بای ماندوو ، ئەی بای هەمیشی بێ سیما
کە لە قووڵایی برینی مێژوو هەڵت کرد
بۆنی شەبەیخون و جەنگەکانت لێ دەهات
پشکوتنی گوڵەکان لەگەڵ خۆتا مەبە
بۆ لەحزەیەک خۆت لە حەشارگەی جلی ئاوێنەیی بترازێنە
تا بزانم تۆ چی... لە ئەزەلی
یا لە قورقوشمی گریانی هەزار ساڵەی
تۆ چی؟ لە بریسکەی سەمای
یا لە خەونی جاویدانی...
هاگوڵە هەڵوژەیێ ماندوو نابێ و سەما دەکا
دار کاژەکان شریخەیان دێ ئەوە تۆی با ؟
فەرموو وەرە ژوورەوە



## کتێبی جەنگ

- فەیلەسوفەکانی شەڕ
- باخچە هەڵواسراوەکانی مید
- ڕاهیبەکانی وەهم
- شیکار
- کۆست
- سیپارەیەک لە ئیستەتیک!
- خۆڵەمێش
- دوای سەعاتی بیست و پێنج
- یادستان
- ئەڵقە

## فەیلەسوفەکانی شەڕ

گەڕامەوە نەچووم ئەو مەلانە بدۆزمەوە
کە لە شەوێکی بەفرانبارا ونم کردن
زۆر نهێنی منیان پێ بوو
نەچوومە سەر ئەو گۆڕە غەریبانەی
لە شەڕێکی خوێناویدا
خاک و خۆڵی ڕمی سواران دایانپۆشی
نەمتوانی چاویان دابخەم
بەجێم هێشتن ئەو منالە گەنم ڕەنگ و قشتیلانەی
لە دوورەوە بەپەنجە بچووکەکانیان هێمایان بۆ دەکردم
منیش لە زریانێکی تووشا عاسی بووبووم
هەموو ڕۆژەکانی عومری من پڕ شەڕ و مەنفایە
ڕۆژێ نەبوو بێ فرمێسک شەو بەڕێ کەم
تەقە نەیهێشت کتێبەکانم تەواو بکەم
تەقە نەیهێشت جارێکی دی دایکم کراسە ڕەشەکەی فڕێ دا و
گۆرانیەکەی جارانم بۆ بلێتەوە
شەڕ نەیهێشت نوکتەکانم تام و بۆی بمێنێ
نەقە نەیهێشت منالآنمان تێکەڵ بەیەک بن
بەعاشقی بمرین
مارکس گوتی... شەڕ هێندێ جار نیعمەتە
بەهەڵەدا چوو!
ماو گوتی شەڕ هێندێ جار ئاشتییە
بەهەڵەدا چوو!
فرۆید گوتی شەڕ جنسییە و دەبێ ببێ
ئەویش بەهەڵەدا چوو!
گاریبالدی گوتی شەڕ مانەوەیە





بەهەڵەدا چوو!
گیڤارا گوتی شەڕ ڕزگارمان دەکا
بەهەڵەدا چوو!
هەموو ئەو پیتۆڵانەی بەقەد نەنکم ئاقڵ نەبوون
کە گوتی: شەڕ ناهێڵێ قەیسیەکانم وشک کەمەوە
شەڕ ناهێڵێ مریشکەکانم لەسەر جووجەڵە دانیشن
شەڕ ناهێڵێ بووکەکەم منالێکی جوانی ببێ
ببمە خاوەنی نەوەیەک
لە میانی نەنکم و مارکس جیاوازییێکی ئابوورییە
لە میانی نەنکم و ماودا جیاوازییێکی فکرییە
لە میانی نەنکم و فرۆید جیاوازییێکی دڵدارییە
لە میانی نەنکم و گاریبالد جیاوازییێکی ئەقڵییە
جیاوازییە ئابوورییەکەی نەنکم و مارکس ئەوەیە
مارکس کارگە بەباشتر دەزانێ بۆ قەیسی
لەلای نەنکم هەتاوی گەرم
جیاوازییە فکرییەکەی نەنکم و ماویش ئەوەیە
ئاشتی لای نەنکم ئەوەیە شەڕ نەبێ
لای ماویش ئەوەیە شەڕ دروستی بکا
جیاوازییە دڵدارییەکەی نێوان نەنکم و فرۆید ئەوەیە
جنس بەدڵدارییەوە خۆشە لای نەنکم
لای فرۆیدیش سروشتی شەڕە
جیاوازی نەنکم و گاریبالدی ئەوەیە
ئەقڵ لای نەنکم نەبوونی ڕزگارییە بەشەڕ
لای گاریبالدیش بوونی ڕزگاری بەشەڕە
کامیان ڕاستن نەنکم یان ئەو فەیلەسووفانە
شەڕ بوو نەیهێشت لەم موعادەلە قورسە بگەم

## باخچە هەڵبزڕکاوەکانی مید

ڕۆحێک بوو لە شووشەی شکاوی
دوا قەترەی مەی ئەچوو
کە بانگی ئەکرد و ون ئەبوو:
هێشتا وەرزی تەیرەکانی خورافات نەهاتووە
هێشتا سرووتی تەرمە نەناسراوەکانی ئاشور
لەژێر ستوونەکانی بابلدا سیرەیان دێ
باخچە هەڵواسراوەکانی ئەبیکور هەر ماون
شاگردەکانی لە شەڕی بێ هودەیی بێنەوە
تۆ گەندەمووی ڕووخسارت سووتاند و
سەری پڕ شکۆی خۆت لە بەفر نا
گەڕایتەوە شارە سەرابییەکانی عەدەم
کە شاژنی -مید- هێشتا لە خەو هەڵنەساوە
چەند پریاسکە گوڵێ لە بادەم
لەبەردەم میرنشینەکاندا ریز بکا
ئەمە دوا برووسکەی سەر زاری ئەو فاڵچییە دۆلفینە بوو
بە مشتێکی پڕ لە گەنم
باوەشێ پڕ لە کتێب
کاسەیێ لە شەراب
بەرەبەرەی ئێوارە کە خۆی و
شمشێرێک لە دوعا
زەمبیلێک لە نزا
خەریتەیەک لە حیرەت و
نووشتەییێکی پڕ لە ئیرۆسیەت
ئەگەڕایەوە ئەو مەعبەدەی
تاوێرە بەردەکانی لە سیحرێکی شووشەیی و





گومەزەکەشی لە پەلکە گیای خلود
ئیقاعی زەنگیشی لە مەرمەڕی غەیب غەرق بووبوو
تەمتومانێکی شەرابی ئەو ناوەی لە مەستی گرت
لە سامی قیامەت ئەچوو
لە تەمی سەر ئەو گوڵانە ئەچوو
سوڵتان لەبەر خاتری سەگەکان و
کچە غەجەرییەکانی قەفقاس
چێی کردبوو
سەدای ئەو پیرێژنە عەڕافەم کەوتە بەر گوێ
کە ئەیگوت
مشتە خوێنێ ڕژا
سروشت تەژی قەفەز بوو!
گومانێکی ئاڵ و زەمزەمەی یەقینێکی تەنک
دارستانی خاڵی کردم
یەخدانی سەری شکاندم
هاوارم کرد ئای ئەو ڕێیانە ئەچنەوە کوێ؟
جۆبارە غەمگینەکانی عەدەمن
هێندە نهێنی ئامێزن
سەدای عەڕرافە پڕ سامەکەش تا دەهات
ئەتگوت شووشە شیری دەست منداڵەکانی ئاسمانن
ورد و خاش هەڵئەڕژایە بنی ئاوەوە و
لە کپیدا نقووم ئەبوون
ماڵەکەی من نیوەی لە گەڕەکی بەهەشت بوو
نیوەکەی تری لە دۆزەخ
هاوارم کرد کە تاجە بەخوێن شەلاڵەکەی مید
کەوتە بەرگوێ قاجار و سوڵتانەکانی عوسمانلی

ئەوسا ئیمارەتەکانی باشوور
خەریکی کۆکردنەوەی چەک بوون
بابان حەوت شەو و حەوت ڕۆژ بێ ئاگا
لە سەمای پەریخان بەسەر ئاوی بۆن و گولاوا
ژنی بۆ ئەمیر ئەهێنا
میر محەمەد لە هەر گوللە تۆپێ دەیان سەری شاباش ئەکرد
بەدەم و دۆیکەوە بانگی کردمەوە
ئەوسا دوا تیشکی ئارموشینی خۆر لە نەخشەکەی میدا
ئاوەکانی ورمێ و گوڵەکانی وان و مەریوان–ی
پڕ لە پەپوولەی پرسە و تەتەری خانزاد ئەکرد
سەدا سوریالیەکەی کاوەیس
جانتای ڕێبواران و قاسیدانی
پڕ لە تێشووی گریان ئەکرد
بانگی ئەکرد:
بگەڕێوە شەوێکی تووش
تووشتر لە هەنگوێنی گومان
کە هاملێتی لەنێو تەرمی خۆی ئەخنکان
تاریکتر لە مردن لەنێو قەفەزی ئازادی:
هەتا زووە سوارەکان بانگ کەوە
با ئەو هەموو تەرمە نوورانیانە
بەرنەوە گۆڕستانەکانی مێژوو نەبادا
نوور لەم ولاتە قاتی بێ
هەتا زووە شمشێرەکانتان بکەنەوە شان
نەبادا بریسکەی خودایی لەم نیشتمانە نەمێنێ
ئەو مشتە خوێنە ڕژاوە
سەری پڕ لە ئومێدی ئەو سوارانە بوو



کە لە باخچەی یەقینەوە
ئەچوون بەرەو فەنا بەخشی هەتاو
گەردەنی ئەو ئەسپە کەحێڵ و سورخنانە بوو
لەبەردەم شەمشێری ڕۆحیان
بەچاوی ئەبلەق ئەیانڕوانیە لووتکەکان
مێژوو بووبوو بەقەفەزیان
ئەو مشتە خوێنە ڕژاوە
تاجە خوێناوییەکەی میدیا بوو
کە پڕشنگی خۆر لێی ئەدا و
ئاسنگەرانی دەرسیم و مەیتەرەکانی ئاگریداغ
خۆیان لەبەر گەرم ئەکردەوە
کە ئێستاکەش فەلەک لە دوای فەلەک
سوڵتانێ ئەیداتە دەست سوڵتانێ
لە کۆشکێ ئەچێتە کۆشکێ
سەدەییێکە ئەو چەند دێڕەی
پیرەژنە عەڕڕافەکە بۆی خوێندمەوە
لە تەوێڵی ئەو تاجە ڕەش ناکرێتەوە
کە نووسراوە
«من بەو سەرەوە ئەنازم
یەکەمین جار لە ژێرما بوو»
سەدەییێکە میرێ ئەیداتە دەست میرێ
لە کۆشکێ ئەچێتە کۆشکێ
شەمشێرێ ئەیپەڕێنێت و تەختێ وەری ئەگرێتەوە

## ڕاهیبەکانی وەهم

هەمیشە لە غەیبەوە سوارێک هەیە لۆگۆستان ئاشکرا بکات
هەمیشە لە دوورەوە بایێ هەڵ دەکات ئەقڵتان بخوێنێتەوە
هەمیشە لە نادیارەوە شەبەیخونێ دێ تار و مارتان بکات
هەمیشە و هەمیشە کتێبێ هەیە پەشیمانتان کاتەوە
ئەو جەنگاوەرانە چەند بەتاسووقەوە ڕادەکەن
تا بگەنەوە ئەو جەنگەڵانەوە بچنەوە سەر ئەسڵی خۆیان
چەند بەلەز ڕووەو کانی خوێن شۆڕ دەبنەوە
تا شمشێرەکانیان بشۆنەوە و بۆ تاوێ دونیا ببینن
زەینی ئەمانە لە تەمتومانی هەرماس بوو
ئەقڵیان لە مشتە کەفێک و چەند مەترێ سەراب بوو
بازوویان لە گڕی وەهمێکی ئەبەدی
چاویشیان لە خوێنی ئینسان بوو
جەنگاوەرەکان شمشێری دەستیان شکابوو
بەڵام خوێنی شەڕ لە دەمارەکانیان چکی نەدەکرد
نیەتی تۆڵە و غەریزەی جەنگەڵی لە ڕۆحیانا دەکفکفا
پێیان وابوو ئەم شمشێرە پەیتوونێکە و بەرەو یۆتۆپیایان دەبا
بەرەو جۆگەڵەکانی عەدن و
ستوونەکانی ئیرەمیان پەلکێش دەکات
هەمیشە بەدوای ترووسکەی ئەم شمشێرە ڕایان دەکرد
ڕایان دەکرد و... ڕایان دەکرد و... ڕایان دەکرد
کە لە غەیبستانەوە وەک هاوارێ بانگی دەکردن
هەندێ جار تێکەڵی لوورەی گورگ دەبوون و گورگ ئاسا ڕایان دەکرد
هەندێ جاریش خەرەندی گوناه قووتی دەدان
شەکەت دەبوون
دەکەوتن





هەڵدەستانەوە و ڕایان دەکرد
کەچی دەستیان لە شەڕ بەرنەدەدا
لە یەکەم بەرەبەیانی مێژوودا کە پڵنگ و مرۆڤ
لە پشت چارۆگەی زارادا
لە دەوری کورە بورکانەکانی ئەڵقەیان دەبەست
ئەو جەنگاوەرە بازوو کوتراوانە بەسەر پشتی مۆرانەوە
هەر خەریکی بڕینەوەی دار و سڕینەوەی ئینسان بوون
خەریکی ببر لێدان و خەنجەر تیژکردنەوە بوون
کۆمەڵە گوێزانێک بوون لەناو ماڵی تەهارەتدا
چەند باقەبێنێکی ئەبەنووسی بوون لەسەر مەرکانەی نووردا
هەمیشە هەر لە جەنگا بوون
جەنگ... جەنگ... جەنگ
شیر و تیر ئیمامیان بوو
بازوقەی خوێن قیبلەیان بوو
جەنگەڵەکان نیشتمانیان بوو
جەستەی مرۆڤ بەرماڵیان بوو
نە شمشێریان فڕێ دەدا و نە وچانیان دەگرت
هەمیشە هەر ڕایان دەکرد و ڕایان دەکرد
زەینی ئەوان لە تەمتومانی شەیتان بوو
ئەقڵیشیان لە گوزازی ژەنگ
هەریەکە و کتێبێکی قەبەیان لە بارەی شەڕ و کوشتار لەبەر باخەڵ بوو،
وێنەی هەموو مەتحەفەکانی جەنگ و پاڵەوانەکانی سامۆرایی و
شمشێروەشێنەکانی فتوحات و پەیکەرەکانی شەڕی تێدا بوو
لاپەڕەی یەکەم
وێنەی قەسرێکی بڵندی سوڵتانەکان بوو، حەلاج دەست و قاچی
پەل دراوە و لەوێوە فڕێی دەدەنە ناو دەریا

لاپەڕەی دووەم مەقسەڵەکەی ڕۆپسپێر
لاپەڕەی سێهەم کورە ئاگرەکانی نەیرۆن
لاپەڕەی چوارەم فڕنەکانی هیتلەر
لاپەڕەی کۆتایی ئەنفالەکان... ئاخ ئەنفالەکان
هێندەی دیکە شمشێری دەستیان تێنوتر دەبوو
ئەو جەنگاوەرانە چەند زیرەک بوون... لە دەرسی کوشتن
ئەو جەنگاوەرانە چەند ئازا بوون... لە خوێن ڕشتن
ئەو جەنگاوەرانە چەند خێرا بوون... لە ڕاکردن
ئەو جەنگاوەرانە چەند وەستا بوون... لە سووتاندن
زارا دەیگوت:
ئەشکەوتێ هەیە بۆ خۆشەویستی بەدرێژایی مێژوو چۆڵە
پەنجەرەیێ هەیە بۆ پاکی بەدرێژایی مێژوو داخراوە
تەوقەیێ هەیە بۆ دۆستایەتی هەمیشە تەنهایە
کتێبێ هەیە بۆ سەفا تا ئێستا نەکراوەتەوە
ڕووبارێ هەیە بۆ تەهارەت کەس مەلەی تیا ناکا
قومە ئاوێ هەیە بۆ عیشق کەس نایخواتەوە
ئەشکەوتی خۆشەویستی: جەنگاوەرەکان خۆیان تێدا مەلاس دەدەن
بۆ شەبەیخون
ئەو پەنجەرەیە: جەنگاوەرەکان لەوێوە بە شیر و تیر دڵان دەپێکن
ئەو تەوقەیە: جەنگاوەرەکان بەشمشێر لە هەنگڵەوە پەلی دەدەن
ئەو کتێبەش جەنگاوەرەکان پەڕە پەڕە دەیسووتێنن
ئەو ڕووبارەش: جەنگاوەرەکان ژەهراویان کرد
ئەو قومە ئاوەش: جەنگاوەرەکان ڕشتیان
ئێستا دونیا خاڵی بووە لە عیشق
ئێواران ئەو جەنگاوەرانە لەبەر ڕەشەبا کۆ دەبنەوە و زناری شەڕ
دەکەنەوە...



ئەو زنارەی زارا بۆ موریدەکانی هێنا بوو
بەڵام سوارەکان کردوویانەتە ڕەمزی خوێن
چەندین سەعات و سەعات
سەریان بەسەریەوە هەڵناگرن
ئەوسا یەکە یەکە ڕادەبن و تاو دەدەن و دەلوورێنن
هەمیشە لە بنار بوومەلەرزەیێ هەیە لوولتان بدات
هەمیشە لەناو دڵتانا وەسوەسەیێ هەیە قاوتان بدات
هەمیشە لەناو خوێنتانا ڕمێ هەیە گیانتان دەسمێ
زارا گوتی:
جەنگاوەرەکان شمشێریان ورد و خاش بوو
شەکەت بوون، کەوتن، هەڵسانەوە
بەڵام هەر ڕایان دەکرد و ڕایان دەکرد
تا تێکەڵی گەلە گورگی مێژوو بوون.

## شیکار

ماڵێک بۆ هەمووان
ماڵێک بۆ جوانی
ماڵێک بۆ شایی
ماڵێک بۆ حیکایەت
ماڵێک بۆ ئێستا
ماڵەکەی هەموومان نە دەرگای هەیە نە پەنجەرە
ماڵەکەی جوانی کرایە کارگەی خۆڵەمێش
ماڵی شاییش ئێستا دیوەخانی پرسەیە
ماڵەکەی حیکایەتیش بۆتە مەتحەفی شۆڕشان
ماڵی ئێستاش بۆتە ئەلبوومی شەهیدان
حیکمەتێکی کۆنینە
حیکمەتێکی پڕ لە نوور
حیکمەتێکی ئاگراوی
حیکمەتێکی تووڕە
حیکمەتی کۆنینەمان فڕێ دایە دەریا
حیکمەتی ئاگراویمان دایەوە زەردەشت
حیکمەتی تووڕەشمان کردە پاشا و قەمچییەکمان دایە دەست
کتێبێک لە باخەڵی شا
کتێبێک لەسەر ڕانی پیرێ
کتێبێک لە ڕەفەی دیوار
کتێبێک لەبەر ڕەشەبا
کتێبەکەی باخەڵی شا نەخشەیەک بوو بۆ کودێتا
کتێبەکەی سەر ڕانی پیرێ خەونی دوارۆژ
کتێبەکەی سەر ڕەفی دیوار هی دەستێکی پڕ لە نوورە
کتێبەکەی بەر ڕەشەباش هی نیشتمانی منە





ئیمارەتی سۆران
ئیمارەتی بابان
ئیمارەتی بادینان
ئیمارەتی ئەردەڵان
ئیمارەتی ئێستا
ئیمارەتی سۆران کۆمەڵە سوارێکی سەرگەردان بوون
ئیمارەتی بابان کۆمەڵە شێرێکی کوێربوون
ئیمارەتی بادینان قەفتەی شمشێرێکی شکاو
ئیمارەتی ئەردەڵان کارگەیەکی بێ ئاگر
ئیمارەتی ئێستێشمان بێ تەیمان
خەمێک بۆ برین
خەمێک بۆ سنوور
خەمێک بۆ گەل
تاجە گوڵێک
خەمێک بۆ برین بەشی هەموو برینەکان ناکا
خەمێک بۆ سنوور دادی هەموو گورگان نادا
خەمێک بۆ گەل ناکاتە دەمێک دڵپاکی
تاجە گوڵێکیش بەشی ئەو هەموو شەهیدە ناکات
ڕەوە ئەسپێ
ڕەوە سوارێ
دەسکە گیایێ
باقە ئەستێرەیێ
من
ڕەوە ئەسپێ لە ترسی هەڵەمووت چوونەوە ئەشکەوتان
ڕەوە سوارێ لە خەرەندان هەڵدێران
دەسکە گیایێ لە ترسی سیس بوون دەگریان

باقە ئەستێرەیێ لە ترسی هەورە تریشقە دارژان
منیش لە وەڕسی پیر بووم
کۆتایی شەو
سەرەتای سپێدە
دوورترین کەنار
قووڵترین برین
کۆتایی شەو دڵێ بوو شیعری تیا مرد
سەرەتای سپێدە شەوێ بوو مانگی تیا زا
دوورترین کەنار خەونێکە لە کۆڵانەکانی یوتوپیا
قووڵترین برینیش نیشتمانێکە لەبەر ڕەشەبا
گەڕانەوەی با
کۆچی مەلان
مەرگی شاعیر
ڕووخانی ئاسمان
گەڕانەوەی با کاتێک بوو گەڵاکانی چووبوونە ماڵ
کۆچی مەلان ئەو کاتە بوو هەموو کۆشکەکان تەپی بوون
مەرگی شاعیر ئەو کاتە بوو نیشتمان کەسی تیا نەما
ڕووخانی ئاسمان کاتێک بوو باران کوژرا





## کۆست

نامەی جەستە بەخوێنەکەتم خوێندەوە
پیاوی هەڵۆم تیا دەبینی بەناکامی چۆکیان دەدا
خەونی ئاڵی خۆم دەبینی هەڵ دەوەرین
وەک خۆم وا بوو
هەموو شتێ لە نامەکەت دارمان و بێ ئومێدی و ڕەشەبا بوو
منیش ئێستا وەک چەندین هەزار جار کۆست کەوتە
هەمیشە دادەژاکێم و دەتوێمەوە
منیش ئێستا نە هیوام بەڕابردوو هەیە
نە بەئێستای خۆم دڵخۆشم
نە ئایندەی خۆم دەبینم
وا دەزانم لەوەتەی بووم و هەروا کەنەفت و کەم بینم
گەلەکەمیان لە لووتکە هەڵدا خوارەوە
قەڵای ئومێدیان ڕماندم
جارێکی دی شەبەیخونی دمدمیان بەسەر جماندم
ئومێد: کەنارێکی شینی کاکۆڵدار بوو باڵیان بڕی
مێژوو: دار کاژێکی سەوزی سێبەردار بوو لە قەدەوە هەڵیانپاچی
خاکەکەشم: جوانترین مێرگی سەر زەمین بوو داگیریان کرد
من لە خەمی کۆیلەتی خۆم ددانە جوانەکانم وەرین
ئای گەلەکەم چەند خەمبارم
چەند خەمبارم
چە
ند
خەم
با
ر
م

## سیپارەیەک لە ئیستەتیک

(١)

ناونیشانی: دۆزەخەکەی باربۆسە
بەرگەکەی: وردە ئێسقانی ناو جەنگەڵی شەڕەکانی جیهانییە
ناو بەرگەکەی: غەرەسەری کوژراوەکانی فتوحاتە
پەڕی یەکەم: پێشەکییەک بەقەڵەمی خوێناوی ئەدۆڵف هیتلەر
پەڕی دووەم: وێنەی قەلنەکەی ستالینە
پەڕی سێیەم: زنجیرە داغەکانی عوسمانلییە لە ملی ئاگریداغ
پەڕی چوارەم: هەڵمی سەر دۆزەخی تەرمەکانی قەڵای دمدمە
پەڕی پێنجەم: وێنەی شاعیرێکی دەربارە دەنەڕرێنێ
پەڕی شەشەم: کوندەپەپوی سەر جومجومەی لۆزانە
پەڕی حەوتەم: گورگەکانی پاریسی دوای کۆمۆنەیە
پەڕی هەشتەم: وێنەیەک لە شەڕی خوێناوی براکان
پەڕی نۆیەم: پانۆڕامایەک لە ئەنفال
پەڕی دوایی: سەری ئەسلەعی گۆرتباتشۆفە
دووکەڵی سوڤیتاتی لێ هەڵدەستێ
ناو بەرگی دواوە: بەندیخانەکەی باستێلە پڕ لە سارتەر
بەرگی دوایی: جۆگەلەی خوێناوی عبدالخالق معروفە
چاپەکەشی: چاپخانەییێکی شکاوی فاشیەتە
تیراژەکەی: بەقەد داوە ڕیشی تەڵخی وڵاغەکانی تەتەرە
نرخەکەشی: خوێنی بەناهەق ڕژاوی ئینسانە
خوێنەریشی: بکوژانی لەقلەقەکەی سەر منارەی خانەقایە

(٢)

دە ساڵی یەکەمم بەرائەت و گریان و یاری بوو
کە هێشتا تامی شیر لە زارما جریوەی هەر مابوو



دە ساڵی دووەمم خەمگینی و هەرزەیی
قەڕوحی گەنجێتی و سەرسامی
دە ساڵی سێهەمم ئایدیای شۆڕش و خەونی پووچی دەوڵەت
ترس و لەرز، ئەشقیایی... تەسلیم بوون
پێنج ساڵی چوارەمم شەراب و گفتوگۆی زۆر توند و
کتێب و وەڕەسی و یاخیبوون
ساڵانی دواییشم لە شەڕێ بۆ شەڕێ پڕ ترس و زەندەقچوون
لە گۆڕێ بۆ گۆڕێ
لە ماڵێ بۆ ماڵێ فرمێسک و پرسەی خوێن
لە هودنەی شەوێک و بۆ هودنەی چەند شەوێ
بەلاغی عەسکەری و هەڵوەرینی قژم
ئێستاکەش بەسەر گردی تووشی ناوەندی تەمەندا
سەیری ئەم خوارەوە دەمکوژێ کە دەڵێی دۆزەخی دانتیە
ڕۆژێکیان کەوانەی پشتمە وەک خەنجەر سیپڕەی دێ
ڕۆژێکیان سستبوونی خورپەی دڵ
کز ئەقڵی و هۆش بازی یا شێت بوون
ڕۆژێکیان کەوتن و شەکەت بوون
خەوتنی شەقام و بەردەرگەی خانەقا
دوارۆژیش ساتێکە مەرگمی گەرەکە
ناشزانم ئەم ساتە کەی دێت و ڕام دەدا
دوا ماڵیش... ئاخ دوا ماڵ گۆڕێکە
چەند دۆست و ئەحبابێ بەپەلە لێی دەدەن
دەیکەنە نیشتمانی کپ و ئەبەدیم





## خۆڵەمێش

قەفەزی ڕۆحی خۆم کردەوە ئاوابووم
هێشتاکە مەل مابوون بڕستیان نەشکابێ
داو داوە هەناسەی کەمتیار ئاوزینگی نەدابێ
تەونکێش هەر مابوون دوا دڵۆپ ئارەقەی ڕوومەتیان
بەسەر میرابی خەونی پاشا نە چکا بێ
بای دەهات دارگەزی ڕۆخانەی بن چیای دەهەژان
دەرگای لە قومری خوێن دادەخست
پەڕ و باڵی هەڵۆی بەسەر تەرمی شاخان شل دەکرد
ترێی چاوی ڕەشی قرژاڵی پڕ لە تای کل دەکرد
هێشتاکە ماڵەکان هەر مابوون
تۆوی گریان لە مەزرای چرادا بچێنن
جوخینان شەقڵ دەن
مێگەڵ لە هەوێزان کەنەوە
هەر مابوو بزنە کێوی گرەو لە خۆری ڕاوچیان بەنەوە
لە شاخی یەکتری بزرمێن
بچنەوە سەر دەمی خەرەندان
تەرم بۆ قووڵایی و زیندووش بۆ ئەشکەوتان
بای دەهات...
هێشتاکە کوختەی بەر سواندەکان ئاوەدان نەبووبوون
شمشێرەی سەر پشتی دەرگاکان هەر سوار بوون
ئەشقیا نەچووبوونە قافی سەرکێشی
گورگی تووش بەکێو وەر نەبووبوون
بای دەهات بایێکی تەماوی
هەرەتی ئەو ناوەی لە بەرد و گۆڕ دەدا
ئاگری لە هەور و بەفری سوور بەردەدا



چیای پڕ لە کەند و لەند دەکرد
هامۆنی لە گردان لوول دەدا
پەنجەرەم کردەوە
هێشتاکە هەر مابوو دز دەمامک بدەن
خەنجەران لە کالآن دەرێنن
تاژی لە ڕاوی کارمامزان بێنەوە
قاویتی ئەستێرە تێکەڵی زیوانی شەو ببێ
کاروانی یاساغی ڕێگەی دوور
بکەونە نێو دەمی ماشەی ڕێ
واز لە کەوڵە ڕێوی سەر پشیە خەو بێنن
قاچ و پێم نایە نێو بوخچەی شەو ئاوابووم
هێشتاکەش هەر مابوو کەروێشک پاوانان جێ بێڵن
کۆڕەوی قولێنگان بگەنە جێ
چەم هەڵسا و
ئاسمان و زەوی لێک هاتنە پێش
کە ئاوڕم دایەوە
چیم نەدی جگە لە کۆمەڵێ خۆڵەمێش.

## دوای سەعاتی بیست و پێنج

کەنار لە مەستی ئەم هەموو گێژەنە غەرقی ئەبەدە،
یوهانا کەرنەڤالێکە لە نسکۆ،
لەوبەری رووبارەوە وێرای نەورەسەکانی وەڤەنی مریەم گوڵێ
ریز دەکا و،
چاوەڕوانی شاژنی خەیاڵی ببزوێ،
تێلدرەکانی دەوروبەر، وەهمە جوانەکانی، نامەکانی سوزانا
یەکەم دڵۆپە فرمێسک بوو کەوتە سەر لمی کەنار
ئەو ناوە پڕبوو لە شەوق
سوزانا ئێستاکە پایتەختێکە لە شەونم
شارێکە پڕ لە کۆشکی بەرز
مەعبەدتکە تژی لە قدیسە پیرۆزەکان
سوزانا دڵۆپێکە لە فرمێسکی ئەسارەت
گوڵەکەم زیندانەکانی نزیک تۆ دڵیان وەکو ئەم کەنارە
نەدەگوشیم
هەمیشە شنەبایێ لەلای تۆوە دەهات
رووبارێک بووی لە شیری بەهەشت
فەنەرێ بووی لە نووری خودا
گەلەرییێ بووی لە پەیکەرەکانی خلود
یۆهانا لەوبەری رووبارەکەوە پەڕییەوە، ئێستا بۆ تا ئەبەد کەس
لە پەنجەرەکەی نادا،
ئەفسەرێ لە پانتایی سەدەکانی ناوەڕاستا سێوی دەستی منداڵەکە
دەرفێنێ و کەللە سەریشی دەدا بەدیوار
خۆی سێوەکە دەخوا
ئا لەوێوە سوزانا چەمکێ بوو لە نادیاری
حەقیقەتێ بوو لە هولامیەت





تاوسێ بوو لە لافاوی دارستان
مەعبەدێ بوو لە گوناه
یۆهانا دەستی بەرز کردۆتەوە سەر دیوارەکانی ئۆردی، لەو تەیرە
ئەفسانەییانەی بەهەشت دەچێ، رێژنەیێ بارانی دۆزەخی
لە خمیان بنێ و چاوەکانی شین دەچنەوە
ئەوسا کە سوزانا
کیژۆڵەیێ بوو لە فیردەوس
ئاوێنەیێ بوو لە ساماڵ
زنارێ بوو لە کەمەری زەردەشتیەکان
گەنجەکانی گەڕەکی دەخستە نێو تولەی فیراق
عاشقێ بوو ئاهی عاشقانەی
ئاگری لە قەڵنەکەی ستالین بەردەدا
شەبقەی لنینی پڕ لە گوڵی بادام دەکرد
سمێڵەکەی هیتلەریشی هەڵدەکرووزاند
یۆهانا ئێستێکە بەرەو ژوورە پڕەکانی معەسکەری هەشتەم دەچێ
سیخورمەکانیان لە پاڵتۆ نوورانیەکەی دەبەنە خوارەوە
پاڵتۆکەی یۆهانا
لەو کۆشکە سەر لە هەورانە دەچێ
کە پەنجەرەکانیان چلچرای سورخنە
لە هەموو لایەکیەوە سولەی خوێن
لە جیاتی باران گۆرانی دەڵێ
سوزانا بولبولەکانی دەروونی یاڵ ماندوون و هەڵکورماون
ریزە دانە سپیەکانی کۆمەڵە منداڵێکی بەر بەفرن
چاوە شەهلاوەکانی وێنەی سوارانی تیادا
چەند مەلەوانێکی خنکاون
لە سینەی سپیشیا سەلیبی ئێسقان

له بەردەم کلێسا وەستاوە و گوێ لە ئیقاعی مەرگ و ماڵاوایی
دەگرێ
دوو وو وومب
دوو وو وومب
یۆهانا دەچێتە ژوورەوە، ئەو هەموو چاوانە ئەبڵەق ماون، بە
ئەستەم
رۆشنایی منداڵیان تێدا ماوە، بەئەستەم دەجووڵێن، هێندێکیان
لەژێر ئاپۆڕەدا کەوتوون و کەس ئاوڕیان پێ نابەخشێ
هێندێکیان پەنجەکانیان مەقەست خواردووە
وەک مۆمێکی کوژاوە دووکەڵیان لێ هەڵدەستێ
سوزانا ئێستێکە قژە چەرکەسیەکەی سپی هەڵگەڕاوە
مەمکە گومەزیەکانی مەعبەدی سینەی پوت بوونەتەوە
باڵای زراڤی وەک کاژێکی بەر ڕەشەبا کۆم بۆتەوە
فرمێسکەکانی وشک بوون
یۆهانا گەیشتە ژووری پڕ شکۆی سوور، ئیقاعی های هیتلەر
ئەدگاری شەلاڵی عەزاب و داغ بووە
باوکم ئەفسەرێکی نیشتمانپەروەر بوو
بۆ بستێ گۆڕانی سەر قایغی نیشتمان
گیانی خۆی لە دەست دا
کوروغا کەشیشی کلێسای ئاگر و نوور
لە ئەسنای قووداسی تەعمیدا
خۆی و منداڵە رووتەکەی باوەشی
خزانە فڕنە دۆزەخیەکە
سوزانا ئێستێکە لە دەروازەکانی ڕۆمادا
چاوەڕوانە و هەمیشە گوڵ دابەش دەکا
گۆچانەکەی نووری لێ هەڵدەستێ



نەوڕەسەکان لەسەر شان و ملی دەنیشنەوە
ئاسۆ دەگاتە لێواری ڕووبار و، ئەوسا سوور سوور دەچێتەوە
سوزانا لە کوێی
ئێواران کتێبەکەم بۆ بهێنی و
قاوەیەکی تاڵیشم بۆ چێ کەی
ئێستاکە وام لە نێو کتێبی سەد هەزار لاپەڕە
هەر ڕۆژەی لاپەڕەیەکی داغون دەکرێ
پاڵەوانەکانی دەچنەوە باغی حەقیقەت
ئەم ئێوارەیە تاجە گوڵینەکەت لەسەر ئینجانەی ڕۆحم دانێ
ئێستا من لە بۆنی ئەو گوڵانەی بێ وەرزی خۆیان دەوەرن
مەتحەفێکم لە حوزن
گۆڕستانێکم لە ترس
جەنازەیەکم لە ستران
یۆهانا لەبەردەم فڕنە هەزار بەهەزارەکانا
بیر لە تەواوبوونە کتێبەکان دەکاتەوە
ئەوساکە چەمکی بوون تامی نامێنێ
زەوی چۆڵ دەبێ و گۆرانی دەبڕێتەوە
بیر لە بەسەرچوونی وەرزەکان دەکاتەوە
گەلا گەلا گێلاسی چاویان هەڵدەرێژێتە باخی بەهەشت
سوزاناش بەسەر سیسەمەوە دەگری، چاوەکانی کز کز دەسووتێن
دەستەکانی توانای ڕاگرتنی ئەلبوومەکەیان نەماوە
سەیری پەنجەرە کراوەکانی ژوور دەکات
نە بایێ... نە بارانێ... نە ڕێبوارێ
دنیا لە قیامەت بۆتەوە
ساتێکە هەموو شتێ لەبەر چاوی تار دەبێ
یۆهانا چووە سەفەرە سەختەکەی

خۆڵەمێشەکەی ڕژایە باخچەی هیتلەر
ئێستاکە هەر درەختێکی نێو بەرلین
دەست و پەنجە و چاوی کچانی پێوە دێ
عاشقە ساویلکەکانیش لە ژێریانا
گوڵ لە قژی کچەکانیان دەدەن
بەهارانیش کە شەونمی سپێدان
تک تک دەڕژێتە خوارەوە
جۆگەڵەکان دەیانبەنەوە پارکی نیشتمان.



## یادستان

ئەوە قەت نەغمەی تۆ نەبوو
بام بۆ ناردی مشتێ ئەستێرەی ڕژاوی هێنایەوە
مەلەکانی پرچی بەڵقیسم بۆ ناردی
گوڵمێ ئێوارەی تەماوی سەر گۆڕی تۆیان بۆ هێنام
ناچارم لێرە لەو سێبەرە پڕ لە سامە
ئەو سێبەرەی لە خەرەندەی ترسناکی قەدەر دەکا
بۆ تا ئەبەد تێکەڵی ئەو بایە ببم
کە لەلای تۆوە هەڵدەکا.

***

لەو سێبەرەی حەشاری دام
گوڵی چیام پرژاندە سەر ئەو پرچە چیا ڕەنگیەت گوناهم کرد
چونکە عەترێکی ژەهراوی بوو بەو عەترە تۆیان ناسییەوە
ئێستاش گۆڕەکەت هەر بۆنی ئەو عەترەی لێ دێ.
مەلی جریوە زەوی داپۆشی.
بۆلێڵی دڵم، سینەی کون کونم زەردەپەرێکی چیایان گرت
هەر بۆیە ئێستا هالاوی عیشقم... گریەی ئەوینم ڕێ دەسووتێنێ
ئێستاش نازانم گۆڕی مێژووە یا هی ڕێبوارە
بەزرمەی شمشێر بەسمکۆڵی پێی ئەسپە کێویان بەحیلەی
ماین پڕ کردۆتەوە
تەنها سووتاوی ڕۆحی شەکەتی هەوار و برانە
ئەوسا من و تۆ لەو دامێنانە بۆ دەمی چراوکانی ئاواتان
شۆڕ دەبووینەوە
لە نێوان نسکۆی بەردی بن مێژوو و ستێر بارینی دوور ولاتاندا
لە مەرگی کپ و لەسەرخۆوە ڕا بەرەو مردنی توند گوڵمان دەگرت
هەر ئاسکی شاخ و بەهێی لێوار و ماینە حدود بوو





سینەیان دەبووە نەرگزجاری دەشتایی هیرتێ
هەر شەسپی سوور و بەڵەک پەمەیی و سواری ئاگر بوون
لە خوێنی برین هەتا گەردەنیان نقووم بار دەبوون
ئەوسا من و تۆ لە بۆشایی بوون لە بێ ئومێدی بێ ڕەزم و سەروا
شۆڕ دەبووینەوە نێو ئەو خەرەندەی
کەوا ڕووباری ئازارەکانی ڕۆژهەڵاتیمی بەسەریا دەڕوا



## ئەڵقە

بۆ هاوڕێی شاعیرم جەلال بەرزنجی

ئای چەند سەختە، ژاڵەیە، ژەهری هەلایە
دەق بەسەر بانێژەی ڕۆحەوە دەوەستم
بیر لەو جەنگانە دەکەمەوە کە ڕوویان دا
بیر لەو ئاشووبانە دەکەمەوە کە ڕوویان دا
بیر لەو ئاشووبانە دەکەمەوە کە بەرپابوون
بیر لەو خیانەتانە دەکەمەوە مێژوو تۆماریی نەکردوون
بیر لەو داستانە جوانانە دەکەمەوە کۆتاییان هەمیشە خەم بووە
بیر لەوە دەکەمەوە چەندین شار بوونەوە گوند
چەندین چرا کوژانەوە
چەندین ڕووبار وشکیان کرد
ئەوێستاش بیر لەو جەنگانە دەکەمەوە کە ڕوویان نەداوە
بەڵام دڵنیام ڕوو دەدەن
بیر لەو دوو عاشقە دەکەمەوە لە زەردەپەڕێکی پاییزێ
گەڵایان بەسەر دەوەرێ
باسی یەکەم کۆرپەڵەی خۆیان دەکەن ئایندەی ناو بێ
دڵنیام بەیانی سووتوی ئەم جەنگە قورسانەن
ئەوێستاش بەسەر بانێژی ڕۆحەوە وەستاوم
بیر لەو دۆزەخە دەکەمەوە بۆ فریشتە هەڵگیرساون
بیر لەو بەهەشتە دەکەمەوە بۆ شەیتان گوڵڕێژ کراون
بیر لەو مەنفایە دەکەمەوە بۆ عاشقەکان تەلبەند کراون
ئای چەند سەختە ژاڵەیە ژەهری هەلایە.

## کتێبی ڕۆح

- باخی فەنا
- بولبولەکانی فەڕەنسا
- شکستە ڕۆحییەکانی ئەخاب
- ئاوێنەی سێو فرۆشان
- دیلبوون لە ئەفسووس
- ژوورەکانی تەهارەت
- چەکنووسەکانی خەڵوەت
- شەقامێ لە ئاسمان



## باخی فەنا

«بارانێ بوو لە هەڵووژە و سوورە بایێ بوو لە زەمبەق، کۆمارێ بوو لە حەسرەت، دارستانێ بوو لە وچان، ئەفسووس مەرگ مەودای پێ نەداین بگەینەوە باخەکانی خەڵوەت، تۆزێ باسی دارمان و شووشەس شەهدی شەراب بکەین...

شەرابی مەرگی ئاسکان کە دەچنەوە وڵاتی مسک
ئاوازێ لە گریانی جەنگاوەرە کۆنینەکان
تاوانەوەی پەیکەرەکانی بەر دەرگای شار
لەبەر نێزەی ژەهرڕێژ کراوی پاییزی ئەقڵ
ئەفسووس زەمەنێکی چەند پڕ ئەستەم و دژوار بوو
زەمەنی غەرق بوون لە ژەهری هەلا و قیامەتی ڕۆح
زەمەنی تاپۆکردنی برین لە سینەی پەڕەسێلکان
زەمەنێ لە گۆڕستانی دۆستان کە چوونەوە باخی فەنا و
ژوورە کریستاڵیەکانی بیرەوەری
هێشتا ژنانی گۆڕستان
سینەی خۆیان لە کێلەکان هەڵدەسووی
تا مرازی دڵیان لە هەوەس
حەزی چاویان لە جوانی
پانی سینەیان لە جووتبوون شەلاڵ بکەن
هاوار هاوار
چی بۆ ئێمە ماوەتەوە هاوڕێیەتی خەڵوەت نەبێ
هاوڕێیەتی ئەو گۆشە و کەنارانە هێندە ژەهریان تیا ڕژاوە
لە تاوان زەوی گوڵی عەبەسی گرتووە...

«بارانێ بوو لە کۆلارە و زەمانێ بوو لە شەبەق، کۆڕەوێ بوو بەدوای تەرمی باخۆسەوە کە زرینگەی پێکەکانی حەسرەت، تەلارەکانی ئاسمانی لە شووشەی صەفا دەگرت...

ئەمانزانی کەی باڵق بووین
کەی تۆ یەکەم خەونی خوێنت بینی...؟
ئای کە نەوەیەکی بەدبەخت بووین
نەوەی ڕاکردن و ون بوون
نەوەی موزاهەرە و ڕمان
نەوەیەک لە جەنگی خورافات
ئەفسووس پەنجەرەیەکمان نەبینی
ڕێیە باریک و نایلۆنییەکانی مەملەکەتی جوانی تیا ببینین
شەوقی فریشتەکانی بەهەشت و
جیلوەی پەریەکانی کەناری تیا بەدی کەین
هەمیشە لە ژوورە تاریک و نۆتەکەکان نهێنی خۆمان دەگۆڕیەوە
کە وەهم وەک سوڵتانێکی بێ ڕەحم ڕەشی کردن
لە فەتحی ساڵانی نامرادی
جیهادی شمشێربازەکان
کوڕانی حەسار چوونەوە نێو سەدەکانی ناوەڕاست
ئێمە جووتێک بووین لە گریان
«ئەو ئێوارەیە تەمێک بوو لە ژەهری هەلا، قەسووەتێک بوو لە فەنا،
کوشتنێ بوو لەژێر پەیکەرەکەی مەسیح، قیامەتێ بوو بێ ئیزنی خوا...
ئەفسووس چ مەزارێ بۆ ئەم حەسرەتانە چێ کەم؟
گۆڕێکی جوان لە تەمتومان
کێڵێ لە مەرمەڕی گومان
ئاڵایەکی سەر بەخەم
پەرژینێ لە گوڵی بادەم
هەی داد هەی بێداد کەی دەگەمەوە ناو لەپی گەرمی وچان؟
وچانێ هێمنتر لە شەوقی چاوی ئاشک
وچانێ لە پێستی سوورخنی ئەسپ



ئەسپێ لە خێرایی برووسکە
برووسکەیێ لە شەرارەی باران
بارانێ لە هەڵوژە
هەڵوژەیێ لە زەمبەق
زەمبەقێ لە شەهدی شەراب
ئەفسووس چوونەوە نێو باخی فەنا و مەکووتی بیرەوەری.

## بولبولەکانی فەرەنسا

لە پاریسی دڵ هەنار و گەردەن عاجا
لە شەقامە سەر سپییەکەی شانزلیزێ
پیرەژنەکان تاکو ئێستاش کە باس دێتە سەر کۆمۆنە
بەسەر بورجە دونیا دیتەکەی ئیڤلدا
بەدوای یەکەم ددانی وەریویان دەگەڕێن
یەکەم نامەی بەجگەوە داغکراو کوڕەکانیان
کە نازانن گڵکۆکانیان
لە ئوتریشە یا لە بەلقان
کەچی ئەرمەنە کۆمۆنیستەکانی مۆسکۆ
تاجە گوڵی سەر گۆڕی لینینیان فڕێ داوە و
بەدوای لەتێ دڵنیاییدا دەگەڕێن...
سەیری ئاسمانی شار دەکەن
ئەو بولبولە پەڕ شین سینە ئاڵانەی
جان جاک ڕۆسۆیان لە چاوی بەدکار دەپاراست
کتێبی وجود و عەدەمی سارتەرییان
لە مۆرانەی صەکی غوفراندا دادەخست
لە دوای هەموو جەنگە ئەبەنووسیەکانی دوێنێ
پەرش و بڵاوی دونیا بووینە
ئێستا هەندێکیان لە نایجیری
ئەفریقیای ڕەش
نامۆیی دڵیان دەکرۆژێ
هەندێکیشیان لەسەر دەریاری ڤۆڵگادا
بەدڵێکی شکستبار و بەحەسرەتێکی زۆرەوە
هەر پاپۆڕێ کە ڕەت دەبێ بەرەو باشوور
گۆرانییە کۆنینەکانی خۆیان دەڵێنەوە



کە قەرەجەکانی دانوب لە دوای کۆچی ئەبخازەکان
هەڵیان ڕژاندە سەر زەوی
ڕۆح بۆ کەتدراڵە جوانەکانی شەقامی
مارشاڵ لێک دەدەن
ئەوانەی دی لە دوورترین تاڤگەکانی نیاگارا
لە تەبەرستان و مەرسیلیا
لە سەر لووتکەکانی سیرانیڤادا
تا ئێستاش لە غوربەتی لێوارەکانی گاروندا
وردە وردە فرمێسک دەڕێژن
ئەو فرمێسکانەی کە دایکە پڕ نسکۆکان
لە پشت دیواری پاستێلدا
کتێبی مارسیلیزیان پێ شەلاڵ کرد
کردیان بەمیرات بۆ چەرچڵ
ئێستێش بەسەر خوێنە وشک هەڵگەڕاوەکانی
سەرە مەقسەڵەکەی ڕۆپسپێر و
شەکرە تاڵەکانی بن زمانی سیڤەرا
وەکو ئاوێنەکانی ئاونگ و حەوت و براکەی دەبریسکێنەوە
– ئەی ئاوێنە ئێمە بەر برینانەوە چەند قورسین...
بەئاسمانی کلێساکانی پاریس
تاقە بولبولێک لەو نەسلە پەڕ شین و سینە ئاڵانە نادۆزیەوە
چوار بولبولی پێ بەتووکی خەمگین نەبێ
کە بۆنی کتێبەکانی شاخ و دەشتی شارەزووریان لە دڵ ناوە و
پەرتەوازەی ئەم کەونە بوون
بەدیار لە بێن چوونی خۆیان هەروەکو هیندییە سوورەکان
لەناو کوانوی یادگار دەژین...
یەکیان: لە قەفەزی دەستی پیرە عەرەبێکی جەزیرەیە





لەژێر دشداشەکەی خۆیا
هەموو شمشێرەکانی فتوحاتی شاردۆتەوە
دووەمیان: لەناو بەرگی تورکێکی کاکۆڵ تۆزاوییە
لە بن شەپقەکەی خۆیدا
هەموو مۆرە خوێنینەکانی سوڵتانەکان خوێنیان لێ دەتکێ
سێهەمینیان: لەناو لیسی کابرایەکی قەزوێنیە
چوارەمینیان: کەوتۆتە بەر دەستی حەلەبییەک
ئەلبۆمەکەی پڕیەتی لە کیژۆڵە سووتاوەکانی
کەناری داکان...
کوردێکی کاکۆڵ ڕەشی سمێڵ بابڕ
وا ئیمزا کۆ دەکاتەوە بەڵکو سوسیالی فەرەنسی
کۆمەڵەیەک دامەزرێنێ تا نەسلیان نەبڕێتەوە
نەسلی ئەو بولبولە پەڕ شین و بێ گوناهانەی
بێ ئەنوا
لە سەر ئەرزی خودا دەسووڕێنەوە





## شکستە ڕۆحییەکانی ئەخاب[1]

ئەرشیدۆق خۆی و ڕوتبەکانی
کە پێڵاوەکانی بسمارکن
هێشتا لە پیاسەی ئێواران
وەرەس نەبووە
دوای کەمێکی دیکەش جەنگێکی قورس
ئەو ناوە پڕ لە عەدەم دەکا
گۆرانی پڕ زەنای قایغچیان تامی نامێنێ
نەوڕەسەکان ئەو ناوە چۆڵ دەکەن
ئەتڵەسی ئەو ڕۆحەم پڕ دەبێ لە بورکان
دووبارە من بەتەنها دەمێنمەوە
ئەمە هەمیشە سەرەتای کارەساتەکانی منە
سڵاو بۆ تۆ دەریا ، سڵاوی ئەبەدی
منم شای بابل
خاقانی موقەددەسترین کەشتی
-پارچەیێ ئاسمانم کردۆتە خودە-
خوانێکی ڕازاوە بەعاج
بخوری سەمەرقەندی
کەنارێکی مەرجانی، شەپۆلێکی پیرۆزەیی
ئای چۆن ئەم هەموو عیشقە دابەش کەم
- حوتە ئەڤینیەکەم بینی
ئای چەند رواقی بوو-
ئەمەشیان حوتێکی عەنبەری و ئەفلاتونی
پێنج هەزار ساڵە

(١) ئەخاب: پاڵەوانی ڕۆمانی -مۆبی دیک-ی (هرمان هرفل)ە.

کوڕی دەریا و خزمی شەپۆلە
شێتێکی وەثەنی
پیاوێکی حەکیم –
تەنها لە گێژەن و لە هەڵەموتا
دەگاتە کۆشکی نێرڤانا
ئەی سیحری هەمیشە بەتەنهایی
پاپۆڕی سەر ئەم دەریا مەرجانیە
تۆ چیت هەتا بایش
لە ناڵە و وەحشەتی شەپۆلان ڕادەکا
نەوڕەسیش جار جارە
لە ڕقی تەنهایی
لە قوڕی کەناران خۆ دەکوژێ
خۆم بینیم ئەرشیدۆق
بەسەر پشتی فەروڕێژی پەیتونەوە
خۆی و دەسگیرانە نیپاڵیەکەی
دوای گەڕانەوە لە جەنگی پۆلیڤیا و ئەسپانیا
خوودەکەی پڕ کرد لە وەڕەسی حوتەکان
خودی خۆی هەڵواسی بەباڵی نەوڕەسان
تۆش هێشتاکە هەروای
فەرمانی ڕێی دوورت لە دەستە
پاپۆڕان لە تۆڵەی حوتەکان لێ دەخوڕی
مرۆڤێکی سەیرە
گۆڕ بۆ خۆی لێ دەدا و
گۆڕانیش بۆ سەمای قەفقازی شێتەکان دەچڕێ
دەریا ئەی زێدی ئەبەدیم
ماندوو بووم لە ڕاوی ماسیان



لە شەوی درێژی جووتبوونم لەگەڵ ئاو
ماندوو بووم لە گریە و هاواری
زەنگی کلێسا گریکیەکانی کریت
کە تەرمی جەنگاوەرەکانی دیرۆک
بۆ گۆڕستانی لە بیرچوونەوە بەڕێ دەکات
کێ ئەوەندەی قەدەرم بەسەر پشتی پاپۆڕ
ئەرشیدۆقی ناوە بەقۆچی قرشەوە
هەزاران جیو کوندای بەچاوی شینەوە
داوەتە دەم کەڵبەی حوتەوە
من و دەریا جیران بووین
سەرێکمان لە دارستانە چڕەکانی ئەفریقیا
سەرێکیش لەناو خودی دۆقە برسیەکانی لاتین
دەستێکمان لەسەر مەمکی خڕی ڕۆژهەڵات
دەستێکیش گەدایی
لە گەڕەکی بێ منداڵیەتی ڕۆژاوا
من و حوتە عەنبەریەکان خزم بووین
پەنجەرەی پڕ مانای هەرماسمان دەشکاند و
تا ماڵی زۆر دووری خوا دەچووین
ڕازیشمان لای دانتی بەزێوار داناوە
ماندوو بووم... ئەی دەریای پڕ سەمای تەهارەت
من چیتر ناتوانم لە تەک ئەم مردووانە
یاسینی نەجاتم بخوێنم
ماندوو بووم من چیتر ناتوانم
لەگەڵ هاوڕێکان سەما کەم
دواپێک هەڵقوڕێنم
بەدیار نغرۆبوونی ئەم هەموو جوانانە





کە دەریا دەکەنە جواناوی ئەفسانە
منداڵ بووم... من و مەمکی قەدەر برادەر بووین
کە باوکم
نیتاقی عەسکەری لە کەمەر شەتەک دا
سێدارە درێژ و بازکوژەکەی نایە سەر
پۆستاڵە ڕەشەکەی ناو دڵی کافکاشی لە پێ کرد
دوا ماچی وەک لەزگەی
لە تەختی تەوێڵی دایکم کرد
شەمشێری شەهوەتی لە ڕۆحیدا کاس کرد
نەیتوانی من ماچ کا
نەیزانی من ماچ کا
نەیدەویست من ماچ کا
نەیوێرا من ماچ کا
نازانم چەند گوناه بوو باوکم
ماچێکی بێ مێژوو
بێ پەنا
بێ دەنگ و بێ ڕەنگ و بێ سەدا
بەتەنها دەستێکی بۆ سەر هەوراز کرد
دوو وشە... دوو ئیقاع
جە...نگ... جە...نگ
دەتگوت بەردن لە دەم باوکمدا دەبارن
دەتگوت دوو قەلی جەنگەڵی ئەمازۆنی ڕۆحن
لە درەختی ناو دەمی باوکمدا دەقاڕن
دوو وشە... دوو تەقسی ئاسمانی
خوا...حافیز... خوا...حافیز
دەتگوت بخوورن لە دەم باوکمدا داگیرسان



ناو ژووری پاپایان پڕ کرد لە سرووتی بێ دەنگی
کە هاتەوە ڕووتبەکانی دوو پارچە خەڵووز بوون
بۆنی کارەساتی لێ دەهات
تابووتەکەی گەورەتر بوو لە زەمین
بچووکتر بوو لە گوێزێ
کە جەنگی جیهانی یەکەمی بەرپا کرد
بەتەنها مامەوە
هەر هەموو یادەکانیم وەک سەرە سیفۆنی منداڵی
کردە ناو تلیانێ دام بەدەریاوە
چەند مشتێ خۆڵەمێش
تانجێک و میدالیایەکی بسمارک
کە ئەو دەم لە بەهۆی نەمسادا
لە باوەش مادلینا لە پرخەی خەوا بوو
سێ نەجمە و تەختەیەک... هیچی تر
لە دەریای پڕ میهر و موحیبەت
نەمزانی وەک ماچی ئەو باوکەم
بێ مێژوو گۆرانی بۆ مەرگی خۆم دەچڕم
ماندوو بووم
پێویستیم بەتۆزێ گریانە ئەرشیدۆق
ماندوو بووم
پێویستیم بەتۆزێ ژیانە سەرکردەم
ماندوو بووم
پێویستیم بەسەد ساڵ تەمەنە ڕابەرم
ڕزگار بم لەو لەحزە کورتانەی
درێژن وەک حەزیا
بچووکن... زۆر بچووک

وەک ساتی ڕۆحدانی ماسییێ لە هەوا
ماندوو بووم... ئیسماعیل ماندوو بووم
نەیانهێشت تۆش بەرخۆڵە ئاسا
سیکاردێ
ڕێیی دووری قیامەت لە ڕۆحت کاتەوە
هەمیشە و دوای فرمێسکی هەزاران قیرشی خورت
دوای سووربوونی دەیان گۆی شەپۆلان
دوای ڕمانی سەدان کەشتی ئاڵ
بەسەر لووتی داپڕاوی حوتەکان
بەتەنها... تەنهاتر لەو مرۆڤەی غەرقە بێ و
هاواری ناگاتە گوێچکەی خۆی
دەریاکەم سوێر دەکەم لە غیرەت
کە دەستخۆی نەبوو قەت
هەر کەسێ بێ گوناه لوولی دا بخنکێ
دەگریێم غەریبتر لە دەریا



## ئاوێنەی سێو فرۆشان

چۆن ڕابرد نازانم، نە پرسە و نە وەڵام
پرپاسکەی هاوارم ڕژاوە
بێ دەنگیم وەک هەزاران هەزار لووتکەی ورد
بەگۆنای ڕەوەزا پژاوە
بوونە ئەو سەبەتە سێوانەی پەریەکان ئەیخەنە سەر شان و
ماڵ بەماڵ ئەفسانە دەگێڕن
شارەکەم تەژی سێو فرۆش بوو
زۆر گریام، گریانم بارانێ بردیەوە سەر درەخت
مەشخەڵی دۆزەخێ لوولی دا
گریانی زناری کەمەری کچانی زەردەشت بوو
ئێواران پێکەوە دەچنەوە سەر ئاوان
سەیری ئاسۆ دەکەن
چۆن ڕابرد نازانم نە پرسە و نە وەڵام
پەلکە گیای ئاواتم دایە مەل
هەر مەل بوون کراسی ساماڵیان لە جەستەی دەئالان
گوناه بوون بەڕەنگی بەهەشتی دەڕشتران
ئەوەتا ناخی من وەک سینەی فریشتە پڕ بووە لە عەتری خودایی
پڕ بووە لە ناڵەی قامیشی کون کونی سەدان ساڵ جودایی
پڕ بووە لە گریەی پێش وەختی بەبۆکێنی بردن
پڕ بووە لە ترسی پێش مەرگ و دواهەناسەی مردن
یا ترسێ عابیدێ لە دڵی خۆی دەنێ بەرامبەر خوا وەستان
نازانم چۆن ڕابرد... نە پرسە و نە وەڵام
پرس بێ پێی دەڵێم
چۆنە گیا خوناوەی بەیانیان هەڵدەمژێ و باڵ ناگرێ؟
درەخت چۆن کە عەشق لێی دەدا ئەو هەموو گوڵاڵە دەنەخشێ

تریّ چۆن تووڕە بیّ وا تامی شەرابی سەد ساڵە دەبەخشیّ
پرس بیّ پێی دەڵێم
بەر لەوەی کە باران بگاتە سەر زەوی خاک و خۆڵ چ هەستیّ
دایدەگریّ؟
دوو عاشق دوای سەد ساڵ جودایی
کە وەک مار دەئاڵێنە بەژنی یەکتری... چ هەستیّ
پرس بیّ پێی دەڵێم
زستان هات نەهاتی، زۆر مەلم دی لافاو بردنی، لافاوی مەلان بوو
بەهار نەهاتی تەرمی زۆر درەختم دۆزیەوە زەهمانی دڵان بوو
هاوین هات نەهاتی کراسی کانییان لەبەر من کردەوە
بینینی نەهێنیان لە چاوم سەندەوە
بیستنی شەفەقیان لە گوێچکەم کردەوە
گوتاری بەزەییان لە زمانم بردەوە
ئەم وەرزە درەختی ژەهرێکی دەگمەنە
پرس بیّ پێی دەڵێم
دوا ئاوڕت وەک ستێرا داڕژا تا ئەبەد تەنها مام
نزمایی بەربوونە گیانی هەورازم
پرس بیّ پێی دەڵێم
ئاسمان بچووکە و فڕینم گەورەیە
ون بوونت گەورەیە و دیاربوونم بچووکە
کێشەکە ئاسێیە
وەک ئاسێ بوونی مەل لە درکی ڕەشەبا
وەک ئاسێ بوونی ڕۆح لە دوای مەرگەسات
نازانم چۆن ڕابرد نە پرسە و نە وەڵام
وەڵام بیّ پێی دەڵێم
کاسەم بۆ پڕ کردیت ڕژاندت





ئەزانی خوێنم بوو، ئەوەتا ئەو کاژە چەند ئاڵە
سێوی مانگی زەردم نایە سەر زمانت ڕووی خۆتت وەرگێڕا
ئەزانی دڵم بوو، ئەوەتا، ئەوەتا خۆرێکی چەند گەشە
هەموو ڕێگاییێکم بەبای تێپەڕبووی سەر بەهەشت گیاڕێژ کرد
هەناسەی ئاگری دۆزەخت پێ وەرکرد
ئەزانی ڕۆحم بوو، ئەوەتا شاباڵی هەڵۆیان
وەڵام بیّ پێی دەڵێم
هەر من بووم پەرژینم لە کەمتیاری تۆخی جودایی داخست و
ڕێییەکانم دیل کرد
هەر من بووم ڕێی ژەهرم کلیل دا و
کلیلم فڕێ دایە دەریا و ئاشووبم خستە نێو نەهەنگان
نازانم چۆن ڕابرد نە پرسە و نە وەڵام
جوانی خۆم کردەوە گێلاسێ ورد ورد و ئەو کچانە شێت بوون
ڤینۆسی سیمای خۆم بەردایە نێو دڵی تولازان
جگەری ئەم کەونەم کون کون کرد
چەند سەختە مردنی نەرسۆسی و بەعەشقی خۆ مردن
چەند سەختە ئاوێنە مەنفات بێ
نازانم چۆن ڕابرد نە پرسە و نە وەڵام
ئاگر بووم فوێکی سەرمەست و شێتانەی ڕابوونت
منی لە خۆڵەمێش مارە کرد، سەرم بوو دەسووتا
باران بووم، باییێکی زڕمانا زەوی لە دڵۆپەی من تۆران
ئەشک بوو هەڵدەڕژا
هاوار بووم دەستێکی چەپاوڵ
جوانی هاوارمی هەڵتەکاند، دڵم بوو گۆرانی دەچڕی
لووتکە بووم، دامێنێکی چەتوون لێم وەرگەڕا و
ئاوارەی سەر زەوی کردمەوە، باڵام بوو هەڵدەچوو

وەلام بێ پێی دەڵێم
تۆ ئاگات لێ نەبوو، لە دوای تۆ
چ خەونێکم سووتاند... عشقم بوو
تۆ ئاگات لێ نەبوو، سەری شالیری من چۆن کوێرایی داهات
هەستم بوو
تۆ ئاگات لێ نەبوو
دەروونم لێ بووە خەنیم و زەینمیان ڕاگوێزا
خەنیمی عومرم بوو
تۆ ئاگات لێ نەبوو ئەوەی سەد ساڵە جوانی تیا دەرێژم
چۆن چۆنی هەموویان سڕیەوە... زێدم بوو
لە میانی پرسیار وەلاما خاڵێکم کێشم پێ نەماوە
ئەو میانە وەک نەخشەی میانی بەهەشت و دۆزەخە
جیاوازی دوو دیدی فریشتە و هەرماسە
ئەو میانە فرسەخی بەختیاری هەڵە کۆکە
دەزانی وا بەفرە و قڕ دەبێ
کە بەفریش قڕ دەبێت عومری ئەو تەواوە
ئەو میانە نەنەخشەی دیارە و نە شوێنی
دەبینی چەند سەختە ئەو میانە مەنفات بێ
چەند سەختە ئاوێنە مەنفات بێ



## دیلبوون لە ئەفسووس

مخابن زەمانی پیاسەی خۆش نەماوە
برووسکەی شمشێرە لە جیاتی شمشاڵان
سەمای ڕێ ئاڵ دەکا
سووتانی ناو سینەی کتێبە
کتێبێک لەبەر تیشکی مانگا ڕووت و قووت بۆتەوە
تاوێری کەناران بانگ دەکا
کچانی کەناری لەزتن
سینەیان دۆزەخی هەوەسە
دەچنەوە بەر دەرگای مناڵی
درێغا زەمانی شەهادەت
پەیکەر بۆ وێرانی ڕۆح دەکا
باوەشێ تیشک بوو جاویدان
چەپکێ بای توورە بوو لە عومری تروسکە
کە ئەفسووس لە ئاوی پڕ زەنای حیکمەتا دەخنکا
هەڵی کرد و ڕابرد و ڕوومەتی بەیانی داماڵی
ئەو ناوەی کردە خۆڵەمێشی ئەزەلی
سەفای ئەم زەمینەی خستەوە سەر شانی
چی ڕووناهی هەبوو گلی دا و ڕایماڵی
ئەوەتا لەوساوە هەموومان
کراسی پڕ سیحری کتێبمان فڕێدا
لەبەر بارانە سوێی ئەو دەنگەی
کە بۆنی بخور و بوخارای لێوە دێ
سەما لەژێر سایەی ئەو شمشێرە دەکەین
مەرگ مەودای نەداین من و تۆ
بچینەوە لێواری بەهەشت و

سەما لەگەڵ کچۆڵەکانی مانگ بکەین
ئەیکاش ئەو ڕێیە ئەوەندە کورت نەبووا
وەک عومری هەڵەکۆک
تا بوارمان بداتێ و دووبارە
بچینەوە پیاسەکەی ئێواران
لەوێوە بەسەر باڵی سیحر و سەمەندەر
ئێسقانی ڕۆحیشمان گوڵی مەستی بگرێ
بەکۆڕە و شێت ببین
ئەو مەرگە چەند توورە و چەتوون بوو
سەد حەیف و مەخابن
زەمانی پیاسەی خۆش بەسەرچوو
تا بچین لە بوخاری گەرمی هەوەسمان
چرای نێرڤانا هەڵ بکەین
زناری زەردەشتی لە کەمەر ببەستین
دەمانویست پەیکەرێ بەکەناری خۆرا دارێژین
درێغا کچانی قیامەت
سینەیان لە کێڵی گۆڕەکان وەرێنا
مرازیان هەڵوەری
دەبوایە ئەو ڕێگە درەنگتر تەواو با ئەی پەری
مسۆگەر دەچووینە کۆماری ئەفلاتوون
کەشتیمان پڕ دەبوو لە غیلمان
دەروونمان لە بالەب لە جوانی و دەخنکاین
وەلێ ئەفسووس زەمانی پیاسەی خۆش نەماوە



## ژوورەکانی تەهارەت

وەک ڕەوە ئەسپێکی ماندوو بەدەست قەدەری نادیار
شۆڕ دەبووینەوە ئەو ژوورانەی سەفا بەئێمەی بەخشی بوو
ئەو ژوورانەی خشتەکانیان لە ساماڵ و
ستوونەکانیان لە مەڕمەڕی ئومێد بوو
باخەکانیان لە پۆدرەی عەترباری فیردەوس و
غیلمانەکانیان لە ئاوی حیکمەت بوو
گەورە دەبوون... دەبوون بەکۆشکی خەوەرنەق
بچووک دەبوون... دەبوون بەشارە مێرووله
نەرم و نیان بوون... وەک چەند ماڵێک لە گیا
سەوز دەبوون ... وەک چەند باخێک لە کەوەر
وەک فەنەرێک لە فەزا نووری خوایان لێ هەڵدەچوو
درێژ دەبوونەوە دەتگوت جۆگەڵە شیرەکانی عەدەنن
ئاهەنگەکانیان لە شەوانی باخۆسی گریک دەچوون
چەند سیحراوی بوون ئەو ژوورانە
لە ناوەندی ئاسمان و زەوی وەستا بوون
لە دوورەوە لە شەباقەی حەسرەتەوە سەیرمان دەکردن
هەندێ جار تێکەڵی بوڵێڵ دەبوون
ئێمەش وەک کۆمەڵە مەیتەرێ ئەسپەکانیان لە دەست چوو بێ
سەرمان لە سەبەتەی ئەژنۆ دەنا
هەندێ جاریش وەک ناو لەپی فریشتە باوەشیان بۆ دەکردینەوە
بەهەشتاوی شۆڕ دەبووینەوە ئاتەشگا
ئەو ئاتەشگایانەی تەژی سرووتی غەیب بوون
کە پەنجەرەکانیان دەیانڕوانییە سەر بەهەشت
جەستەی حەوایان لێ دیار بوو ، داپۆشراو بەقانێ گەڵا
باخەکانیان پڕبوو لە گوڵ و بخوور





مشتێ جۆگەلەی سەبر بوون هەر جۆگەلەیێ شیعر و گەدای لێ مەست دەبوو
دەفری خۆیان سەر هەڵدەدا و بوزایان دەبەشییەوە
دەیان گەڕناس، دەیان جوامێر، دەیان مێرخاس
لە قومێکا دەتوانەوە
کە خەیاڵ شەکەتی دەکردن لە کوژانەی ئاگر دەچوون
دەیان عاشق گۆرانیان بۆ لایلاکانی خۆ دەچڕی
بادی دەستیان تانگۆیان بوو
چەند سیحراوی بوون ئەو ژوورانە
حەوشەکانیان لە خوناو بوو تەژی بۆراق
بۆراقێ بۆ دانتی میعراجی پیاتریسی دەکرد
لە پێکی یەکەم تەبەقەی سەرەتای تەی دەکرد
ئەوسا غەرقی نوور دەبوو
بۆراقێ بۆ مەیپەرستان کە ماڵەکانیان لە هەور بوو
لە پێکی دووەم دەبوونە شای هەموو دنیا
ئەو ژوورانە دەروازەیان لە ئارمووش بوو
ئێواران وردە وردە پڕ دەبوون لە سەری ماندوو
ئەو سەرانەی جگە لە سەفا هیچی دیکەیان تیا نەبوو
سەرشار دەبوون لە دەستی ماندوو
ئەو دەستانەی جگە لە دۆستایەتی هیچی دیکەیان لێ شین نە دەبوو
مشت دەبوون لە چاوی شەکەت
ئەو چاوانەی جگە لە جوانی هیچی دیکەیان نەدەبینی
ئەوسا هەناسەی یادگاریان بەر هەڵلای ئاسمان دەکرد
دنیا پڕ دەبوو لە نوور و بخوور
لە بۆنی ئەو بخوورانەوە بوزا خۆی دەکرد بەژوورا
سلاو، ئێوارەتان باش ئازیزترین موریدانم
کە دەگەڕێنەوە حەقیقەتی خۆتان



پەنجەکانیان ئاهەنگیان لێ هەڵدەستا
لەو ئاهەنگانەوە داود مەزامیرەکانی خۆی هەڵدەپڕژاند
سلاوتان لێ بێ عاشقەکان
-شەکەت بووم ئەوەندەی بناڵێنم-
هاتوومەتە ماڵی ئێوە تۆزێ لاتان بحەسێمەوە
چاوەکانیان برووسکیان دەدا
لەو برووسکانەوە زۆربا دەهاتە ژوورەوە
سلاو هاتووم شەلاڵی سەما بم
دڵەکان شەرارەی پشکۆیان لێ هەڵدەسا
لەو شەرارانەوە زەردەشت خۆی دەکرد بەژوورا
سلاو هاتووم بەدەوری ئاگری دڵتانا بسوورێمەوە
لە دواجارا ڕۆحیان وەک تەمی سپی هەڵدەچوو
لەو تەمە موقەددەسانەوە مەولانا دەهاتە ژوورەوە
سلاو، مەخلووقە جوانەکان
سلاو پاکیزەترینی عابیدان
سلاو ڕابەرەکانی بەهەشت
کە خولڤاوی پاکترین خاکی ئەم کەونەن
چەند سیحراوی بوون ئەو ژوورانە
دڵیان بۆ یەک دەکردەوە
دڵێک دەبوو بەحیکایەت و ئەفسانەکانی هەڵدەڕشت
ئەفسانەیەک بۆ هەلایسانی ڕاستی
ئەفسانەیەک بۆ داڕسانی وەڕسی
ئەفسانەیەک بۆ پاکی و داد
ئەفسانەیەک بۆ ڕاونانی شەیتانەکان
دڵێک دەبوو بەکانیەکانی ڕۆژهەلات کچانی لە دەور کۆ دەبوو
کانییەک بۆ تەهارەت کە دەچوونە خزمەت جوانی

کانییەک بۆ ئاوخواردنەوە کە سەفەرمان هات و نەهات بوو
کانییەک بۆ مەلەی جوانان کە ئەو ڕۆژە دنیا ڕووت و قووت
کانییەک بۆ تەقینەوە کە بەهار بەبرینداری ڕابرد
دڵێک بۆ گریان...
گریانێ هی دۆزەخەکانی سەرزەمین بوو
گریانێ هی بەهەشتە دوورەکانی سەرزەمین
گریانێ هی تەنیا بوونی ئینسان بوو
گریانێ هی وەڕس بوون
دڵێک پڕ شایی کە پرسە سەردەستەی ڕێ بوو
دڵێک پڕ ڕامان کە ژاوە ژاو سەرداری دنیا بوو
دڵێک پڕ حەسرەت کە تەمەن بەشی خۆشی ناکات
چەند سیحراوی بوون دڵەکانی نێو ئەم ژوورە
خودایە ئەم هەموو دڵە چۆن بوو بەئاو؟!
وردە وردە خۆیان لە گوناه هەڵدەتەکان
ئەو گوناهانەی وەک مارەزیو ڕایان دەکرد و ئەو ناوەیان
جێ دەهێشت
ئەوەی دەمانەوە چەند باڵە فریشتەیەک بوون لەسەر زەوی
کە دنیا بەهۆی ئەوانەوە بەردەوامی دەدا بەخۆی
دەبوونەوە مرۆڤە ڕاستەقینەکەی جاران
دەمامکەکانیان ورد و خاش دەکرد
دەگەڕانەوە ئەو ڕۆژانەی
کە بەڕووتی هاتنە سەر زەوی چاویان پڕ بوو لە تیشکی خودا
بەپاکی هاتنە سەر زەوی دڵیان پڕ بوو لە بەرائەت
بەگریان هاتنە سەر زەوی زمانیان پڕ بوو لە شیری حەڵاڵ
بەحیکمەت هاتنە سەر زەوی هزریان پڕ بوو لە یەقین...
تیشکی خوا: تۆرا لەو ڕۆژەوەی خەنجەر لە دواوە وەشێنرا



شیری حەڵاڵ: تۆوی براوە
لەو ڕۆژەوەی مەمکی کچۆڵان پڕ کرا
یەقین: تەپی لەو ڕۆژەوەی
ئاگر لە ماڵی حەقیقەت بەردرا
چەند سیحراوی بوون ئەو ژوورانە
قسە پڕ دەبوو لە شەکر، چاوەکان لە بریسکەی ڕەحمەت
ئەو ناوە دەبووە پیاڵە چایێ هەموو لێیان دەخواردەوە
دڵیان لە هەموو قسەیەکی ڕزیو
لە هەموو گەڵایەکی سیس
لە هەموو ئادگارێکی پووت
لە هەموو تۆوێکی بێ ڕووەت پاک دەکردەوە
سپی دەبوونەوە وەک بەفری دوندەکان
ئەو ژوورانە لە چەند شارێکی شمشاڵ دەچوون
شارێکی پڕ پەنجەرە و تاق
هەر پەنجەرەیێ ئاوازێ، لە هەر تاقێ عاشقێ
کە شەو تەک تەک لە سەفاخانەی ژوورەکان
ماڵاوایی دەبیسترا وەک کەمانێکی سەرخۆش
ئەو دەم هەموو سینەکان خاڵی دەبوون لە ڕق و قین
لێوان لێو دەبوون لە ئەوین
سەرشار دەبوون لە ئازادی
ئەو ژوورانە ژووری تەهارەت بوون ئەی دۆست.
تە
ها
ر
ە
ت

## چەکنووسەکانی خەڵوەت

«گیانی مەولەویە»

(١)

شەوێکیان ئاگری خەونی خۆم
لە سێوی خەو بەردا و خانەقام جێ نەهێشت
ئەستێرەم یەک یەکە لە کتێبی (دانتی)ی ئاوا کرد
مانگ لەنێو درەختی ئاسماندا
تیشکی خۆی کردە بەڕ
بەجەستەی کچانی سەر حەوزی بەهەشتی خۆی دادا
مەولانا لە زیکری نێو بەڕیای شیرازا تاواوە
درەختی مرازی خەڵوەتگا بێ دەنگ بوو چۆڵ و هۆڵ
مەولەوی دەگریا
فرمێسکی دەبوو بەمەلێکی سپی وەک کوللەی بەفر
ڕیشە سپییەکەی خۆی
بەدەستی عەتراوی نەوازش دەکرد و دایدێنا
فرمێسکی شەلاڵی ئەوینی خۆی دەکرد
لە فەیزی خودایی
خاتوونی تێکەڵی دوا قومی نەی دەکرد
دەفی دەروێشانی عەتار خان
کەونی بۆ ئارەزووی پاکی خۆی
دەکردە دیوان و باڵەخان
کچانی ڕووت و قووت
لە گوڵی پڕ ئاوی -بروست-ی هەمایون
مردنیان دایە بەر شمشێر و تێکەڵ بوون لەگەڵ ڕۆح
ئەو شەوە ئاگرێک لە دڵما داگیرسا



چوومە نێو نوێژێکی ئەبەدی
کە سواری بۆراقی دڵم بووم
دار ئالا و خاک و خۆڵ، خانەقا چۆڵ و هۆڵ
لە ڕووخساری گەشی خوادا تواینەوە
لە نووریا داگیرساین
لەو سەرە چووینەوە ڕێی باریک دۆڵاو دۆڵ

(٢)

ڕووخساری هەتاو بوو مەولەوی
زۆلاڵ بوو وەک ئاوی کوێستانان
ئەو ساتە نوورانیەی شەوێک لە قاپی ئەو
کە پێی نایە تەکیەی پڕوەژدی عابیدان
هاتە لای تۆبەدارەکانی سەردەستی پیرۆزی
لە سۆنگەی ئەوینیا خۆیان دا بە ڕم و چەقۆدا
سەفەری -هیسە- بوو
ڕۆژهەلاتی خستە ژێر چاوی «ئامینە»
مەولەوی بەچاوانی گەورەی فرمێسکی بەگوڕ دارژان
ئەشک بوو بەکۆتر
چووە سەر قامەتی «خۆرەکەی تەبریزی»
ئێستاکەش لە ڕەزگەی چوار دەوری منارە و
گۆمەزی دێرینی تاوەگۆز
دەروێشی شیعری تەڕ
سەفەری ڕۆژهەلاتیان پێیە و
لە سەمای قەفقاسیش گوڵ دەگرن

(٣)

بۆ گڕی ئارەزووی خودایی ئەو شەوە
دۆزەخی گوناهی زۆر دووری (فروغی) خۆم دیوە

بۆ ڕۆحی سەرکێشم
ئەسپێکم بۆ ئاسمان زین کرد و
هەر لەنێو تاریکی بێ دەنگی خەڵوەتگا و ناوداڵان
من ئەوم بەچاوی تەڕی خۆم
بەدڵی پڕ سۆزی خۆم دیوە
کە دوێنێ منتان دی لە کتێبی شەفەق سەری خۆم دادێنا و
لە کەشتی سەرخۆشی «رامبۆدا» گوڵاوم پیا دەکرد
لە سەمای ئەو دیوی هۆشمەوە
تێکەڵی مەشخەڵی ڕێ دەبووم
ئێستاکە پیریەتی سووتاندی
کەوتوونە پاوانی ناو ساڵان
من و پیر و چاکە شێتەکەی بەر ماڵان
لە کەزی درێژی ڕۆح ئاڵاین

١٩٨٣



## شەقامێ لە ئاسمان

خودایە بن باڵم بگرە و مەهێڵە چیتر بکەوم
ڕۆحم پڕ بووە لە خەرەند دیقەتم لە خەتەر دایە
دیدم گەورە و زەمین بچووک
شەوم کورت و خەونم درێژ
چرام کز و ڕێگەشم لێژ
خودایە بن باڵم بگرە و مەهێڵە چیتر هەڵوەرێم
تەمەنی من کورتە و دەزانم ڕۆژێ دێ
شەقامێ لە ئاسمان
کۆڵانێ لە زەوی
ڕووبارێ لە «لالش»
جۆگەیێ لە بەهەشت
خانوویێ لە دۆزەخ چاوەڕێی من دەکا
من بۆ خۆم دڵێکم لە ئاسمان چاندووە
دڵ نییە سەراپای وجودمە
شەوێکم لە لالش هێناوە
شەو نییە کانیا سپیە
تەعمیدی مەرگم تیا کردووە
من بۆ خۆم کۆترێ تەتەری ڕۆحمە
دوێنێکە هەموو گیانی پڕ بوو
لە نووری پەرستگای عاشقان
بخوری سەر گۆڕی مەولەوی هێنابوو
تەمەنی من کورتە و دەزانم ڕۆژێ دێ
ئەو ڕۆحەم کوختێکە بۆ گریان
کتێبێکی گەورە و پیرۆزە لە وەرزی دڵشکان
شمشێری پڕ شەبەقی ئەلیاسە





من ڕەنگم لە ڕەنگی بارانێ ڕشتووە
لە بەهەشت باریوە
من دەنگم لە دەنگی گریانی شمشاڵێ هەڵچووە
لە دۆزەخ ڕژاوە
لە پەلکی پیرۆزی نەیستان خولّقاوە
گۆرانی و گریانم
تێکەڵی نەرمە بابێ دەبێ
دەچنەوە سەر گۆڕی عاشقان
گۆرانیم دەبێتە درووی پڕ سۆزی
ئەو دڵە جاویدیانەی شکان
ئەو دڵانەی وەکو نەرمە گیا
لەسەر دەستی سەفا شێن بوون و
لە خیانەت پژان...
گریانیش دەبێتە فیراقی ئەبەدی
من بۆ خۆم دڵێکم لە کۆشکە بەرزەکانی
هەوری «تاوەگۆز» چنیوە
دڵ نییە سەراپای وجودمە
تاوێکی ئەبەدیم لە بەهەشت هێناوە بۆ ڕۆحم
پڕیەتی لە عەشق و فریشتە و شاپەری
چەند مەستم خودایە! چەند مەستم
ئێستاکە هەر دەڵێی بۆ شیعر خولّقاوم
بەیانیم جریوە و نیوەڕۆم گۆرانی
ئێوارەم پەمەیی و
شەوانیشم خەڵوەت لە گڕی زەردەشتی
تەمەنی من کورتە و دەزانم ڕۆژێ دێ
لە ژێر ڕێژنەی گەرمی بارانێ



یا لە بەردەم هەرای قاوەخانەی «مەچکۆ»
یا لە خەمی شکانی شووشەیێ لە شیعری بادەیی
ئەو ڕۆحەم دەژاکێ
چەند پەستم خودایە! چەند پەستم
ئێستێکە هەر دەڵێی بۆ مەرگ خولّقاوم
بەیانیم خەمێکە لە کەناری دۆزەخ
نیوەڕۆم شینێکە لە حەسرەت
ئێوارەم کۆستێکە لە گۆڕی ئازیزان
شەویشم خەونێکە لە کابووس
خودایە بن باڵم بگرە و مەهێڵە چیتر ئاوا بم
ڕۆحم پڕ بووە لە درز و دڵم پڕ بووە لە شکان
دیدم گەورە و زەمین بچووک
ڕۆحم پڕبووە لە درز، شەوم درێژ
چرام کز و ڕێگەشم لێڵ...





## کتێبی دیدگا

- بەردی مراز
- ئۆرفیوس
- پەیتونی شەرابی
- مەچکۆ ئەی تایتانیکی شارەکەم
- ئەی دژوارترین دۆست
- حەلاڵتر لە شیری دایک
- تا ئەبەد خاچ



## بەردی مراز

«هەڵگرتنەوە ڕۆحی ورد و خاشمە»
خۆزگەم بوو خەونی خۆم بەڕشتەی نادیاری ڕۆحەوە هەڵواسم،
باڵگرێ.
ئەسپی با، لە گەڵای جەستەی خۆم تاو بدەم.
بارانی زمانم لە زەوی کەڤردا بخەمە ڕێژنەی ئاڵ برینم تۆمارکا
ئەوێستاش چرایێ لە خوێنم پێ ئەکەم، تیشکی بۆ جاویدان پەل باوێ
نارنجی هەڵەی خۆم ئەدەمە کەمتیاری بای توورە، تا وشک هەڵگەڕێ
دۆزەخی گەورەییم بکەوێتە گیانی بەفرستان
با مەرجانی چاوم بڕژێتە سەر پەڕەی هۆمای کۆک
با نووری نێو هەنیەم ئایینی بێ دەنگی نێو سینەی وەثەنیم شەق بکا
چەقۆی ئەو ڕۆحەی خۆم لەسەر کام مەرگی تووش کول بکەم
گورگی بەرزایی خۆم بەرهەڵڵای کام مێگەلی نزمایی و خەرەند کەم
کەمتیاری پرسیارم بچێتە کام ئەشکەوتی ترس و کچێنی وەڵامم
شەکەت کا؟
ڕەگی من ئاشنای ترۆپکی ئاسمانە، ئەی دیدگا
با بچینە نێو مەلەکوتی چەند باڵێ لە ڕۆحی سەمەندەر
ژەهری بێ دەنگی خۆم هەڵڕێژمە کام گوڵی پڕ زەنا و لوتسی ئاو بگرێ؟
هودهودی نوورانی بڕیارم لە چرۆی کام قەفەس بەردەم و نەهێن داگیرسێنم؟
وەرە ئەی نیوەی ڕۆحی لە تەم هەڵاتووم مرازی من سەختە
وەرە ئەی نیوەی ون بوو لە داڵی نەمری و کاژی نێو دارستان
لە ڕەگی «با»دام و ئاسمان مشت کوکوختی کوژاوە و گریانە
کەڵی تێنوێتی مەلەی خۆی لە بەستی زمانم کردووە
ئاسکی زۆر خورتی ئەم بایە لە دەستم گیر نابێ و چیا هەڵدەدێرێ
ئەو دڵەی پڕ سیحر کردووم و ئەمباتە نێو شایی و ئەفسانە
باشوکەی قەڵایان لە «با»دا نقووم بوون،

نەورەسییش لە هەڵەی بەفردا تا هەتا بزربوون
ڕووباری خەمی قووڵ، جۆگەی دڵی ساردی سروشت ساتەوە
چەمی بێ ڕۆخانەی ئارامم لە دەریای وشکایی ئەژێت و دامئەگرێ
پرسەی مەرگی نەیستان لە دڵی «مەولەوی» شێن بووە
با لاولاوەی پەنجەی تفەرکم بەسەر وشە هەڵگەڕێ
با پڵنگی ناخم بچێتە بەر نووری ترسێکی ئەزەلی
وەرە فریام کەوە، ئەو عومرەم لە تەنووری چاوی چ نەهەنگێکەوە
تێکەڵی ئاوی سەفا کەم
هەوێردەی ڕوانینم لە پەرێزی زەردی ئەندێشەم باڵی مشت فڕینی
دوور بووە
هێلانەی چیایێ پوشی بێ پەناییم ئەداتە دەمی بێ مروەتی دۆزەخان
کاروانی پرسیارم بدەمە دەست مەلی کام ڕەوەی ئاسێ بوو لە دەریا؟
کام داستانی خەیاڵ لە ئەفسانەی چاوی پەریان کل بار کەم
پەیکەری سەرسامی داڕێژم؟
چی باشە من بیکەم تا خەونی پڕ کێشەی نێوانی ئەندێشە و ئاوەزم
بدەمە دەم گورگی ڕەشەبا و لە بۆشایی بووندا ڕامگرێ؟
پاساری باڵ گەرم و نقووم بوو لە تووکی غوربەتا بۆ ئاسمان تەی ئەکا
لە سۆنگەی سێوی شێتبوونی خۆم نەسووتێم
ئەوەتا سەری بێ ئەشکەوت و مەلی بێ ئاسمانیم
ختمی بای نێوانی مەلەکووتی گریە و ئاهەنگی مەنفایە
لە «با»وە هەڵمکرد: کە هاتم تەنیا بووم
نوورێکی قووڵایی زناران لە باسک و ڕوومەتی من ئاڵا
چی پارچەی بڵاوی ڕۆحم بوو لە بریقەی پڕ نازی تاوسێ یەکی گرت
چی ترێی ترووسکە ئامێز سەرم بوو لە جامی سەرمەستی خرۆشا
ئەم کەونە ئێواران مەسیحای وەک سروشتی ئایینێ لە بخوری
مەجدەل داگیرسان
دامەوە نێو دۆڵ و هودهودی نوورانی بڕیارم دایە پێش



هەر مەل بوو لە شانم هەڵکورما و ڕووبار بوو لە فرمێسکی کانی
خواردمەوە
لە «با»وە هەڵکردن چەند سەختە
لەسەرخۆ ئێوارەم با لاولاوەی زەینی پیرۆزم لە دینی شیعردا
سەرخۆش بێ
ئەی ڕەهابوونی ئاڵ درەنگە
مەرگی من لەنێو کام کەلێنی زیندوویێتی ون بووە؟
بێزارم لە جادووی ئاگاهی، ئەو دڵەم پڕ لە ماینی زەردی ئەفسوونی
مەی بوو
هوشیاریم بۆقەشێی گۆمێکی لیخنە و سەدەیەک ڕای دەدەم
دێتەوە
سەرخۆشیم بۆراقە و لە سەرم ڕا دەکا و نایگەمێ
ژەهراوی وەڕسیم دەرخواردی کام گەڵا مێو بدەم شەرابی ئەزەلم خەستتر کا؟
چەقەڵی هوشیارییم لە گوڵی مەستی دا مەست بکا
سەرەتا لە پێشەنگ بسەنێ و ئاگری ئۆلۆمپی قووڵایی قاو بدا
لەسەرخۆ ئێوارەی ئازیزم
با زنجیری بۆچوون لە بۆشایی گەردوون تاو بدا
بتوانم کۆتەڵی توخاڵی پێشەنگان بدەمە دەم تەور و
ڕەگی ئاگر بەخشی چیایان لە کەڤری سەرسامی هەڵکێشم
قرژاڵی بێزاری نەهەنگم لە شەپۆڵی چاوی کام ڕاوکەر تێنووکەم؟
دامرکانی ڕۆحم لە گڕی چ شیعرێ تاو بدەم؟
یا ئەسپی سورخنی ئەو «با»یە لە گەڵای جەستەما ئاو بدەم؟
ئەزانم تەنکایی ڕووباری پیرۆزم لە گەرووی قووڵایی گڕ ئەکا ئەم
«با»یە
وەلێ ڕێ لە چنگی ڕوانینم ڕەشۆڵەی سەرمابردووی بەفرە
کەروێشکی ئاگریش لە پێستما بەردی بەر هەتاوە
ئەی بێ دەنگی دەریا و ئەی هاژەی تەمتومان کە هاتم تەنها بووم





ئێستێکەش نەدیدەی پەریان لە دیدەی وچانم دەدرێ و
نە مەلۆتکەی هاوار لە سێوی ئادەم جەستە دەگرێ
ئەوەتا کەوڵێکم لە پیرۆزەی ئاسمان ناوەتە سەرشانم
بۆتە لیسی کۆتری وشەی ئاڵی دووتوێی زمانم
پۆڕی ئەندێشەی سەوزی ڕۆحانیم
لە ڕۆحی گەڵگامش گوڵە ئاوی دەمی مار ئەمژێ
بۆ نووری ئەزەلی بەدەوری ئاگردانی زەردەشت نووسام
لە باڵێکا فڕینی ناخم لە زیوی هەڵۆ دائەڕێژم
هەزار ساڵ بەر لە خۆم ئاسمانی بڕیبێ
لە باڵێکا تووکی شەپۆلم لە ڕووبار دەرئەکەم
هەزار ساڵ پێش ئێستا سەرچاوەی لە ئاوی ئەلیاسدا کڕیبێ
هەر ئەبێ دەستم لە ڕوومەتی ئەو سێوە شین ببێ و لەتی کەم بۆ
تاوێ
گەردەنی قوڵینگی بەفراوی ڕوانینم لە کێردی با و بۆران ساوبدەم
ئەوەتا سەری بێ پەناگە و مەلی بێ فڕینم
نقوومی «با»ی مەلەکوتی گریە و ئاهەنگی مەنفایە
١٩٩١/١/١٥



## ئۆرڤیوس

(١)

دەگەڕێم دەستم لە ڕیسی هەور گیر دەبێ و بارانێ توندوتیژ دادەکا
زەوی وەک ئەدگاری پشکۆیان سوور دەبێ و ژووری ساڵ گەرم هەڵدەگەڕێ
زستان بەتەک کوختی زۆربادا گوزەرێ دەبەخشێ و لا دەدا
پێم دەڵێ پاییزان گۆرانی بۆ گەڵای وەریوی درەختی من بڵێ
نهێنیم گەورەیە، پەرچەمی ڕەوەزە شاخەکانی لە خوێنی پرسەدا ئاڵ دەکا
دەگەڕێم دەستم لە ئاگری
چرایەک دەسوتێ و بۆ شەوێ لوول دەخوا
پێم دەڵێ پاییزان با ڕاگرە بالۆرەی منی هەڵگرتووە و پیتی لێ فڕاندوم
نە باران ئەمجارە دادەکا، نە ئاگر کوختی زۆربای مەزن ئاڵدەکا
ئاوازم پڕ گریە وناڵەیە وەردی ئەو دڵەی تۆ پڕ لە باران دەکا

(٢)

دەگەڕێم کتێبی دەستی ئەو دیدگایەم دەگرێت و ڕادە بێ
دەمباتە درەختی ساماڵ و وشەی ئاڵ و ئاسۆی ورشەدار
پێم دەڵێ گوڵاڵەی ڕوومەتی ئۆرفیوس نەماوە و هەڵوەری
پەندور و سێتاکەی ژێر پەنجەی کەوتە سەر شەپۆلی دەریای قووڵ
بگەڕێ بەدوای ئەو ئاوازەی لە ژێی ئەو پەندورە هەڵدەچێ
بگەڕێ بەدوای ئەو گۆرانییە نەمرەی لە دەمی شەپۆلا گڕ دەگرێ
ئەوەیان درەختی هەڤرەسە فرمێسک و بەستەی خۆت بۆ دەڵێ و هەڵچووە
ئەوەشیان کەمانی بای وەشتە بۆ لووتکە و ترۆپکان دەگرێ
نە دەنگم دۆزیەوە، نە پەندوری ئێوارەی شاعیریش
من و ئەو دڵەی خۆم چووینەوە ئەو گۆڕەی هی جەستەی مێژووە





(٣)

ئێستاکە لە دەریای بێ تەهی شیعری ئاڵ هەستێکی بێ باڵم
ئەستێرەی خەفەتم ڕەهێڵەی داستان و ئەفسانە ونی کرد
کەوتوومە بەر فاقی ڕاوکەری ڕم دڵ و دەستێکم دەگرێ
ئەو دەستەی تر دەڵێ دوا مەنزڵ دەبغچی بۆ ماچمان لە ڕێیە
ئای میداس گران هەڵمەڕێژە پەشیمانی خۆتە بۆتە زێڕ
کۆرپەکەت ڕوومەتی شەوبۆی خۆی بۆ مەستیت کردە خێر
تەلارت پەیکەر و داستانی بێ گیانە، بۆ ناگری؟
پەشیمانم لە ئارەزووی خۆم بمدەوە سروشتی جارانم
با هەناسەی ساردم تێکەڵی نێڵەی دۆزەخ ببێ دێر بەدێر

(٤)

باڵی گرت ئەوەتا شین دەچێ و تێکەڵی ساماڵی شین بووە
دەنوکی سوور دەچێ و تێکەڵی چەم ئاسۆی هەمیشە سوور بووە
لە کوێیە گراوم من خوێنم دەسوتێ لە نادیاری شووشەی سیمایا
بڵندیم کەوتۆتە خەرەندی نەویان و لووتکەشم دەسوتێ لە زەوی
ئەشکی هەردوو چاوم تێکەڵی پشکۆی گەرمی دەروون بۆتەوە
ئەو سەرە پڕ بارە و ئەو دڵە پڕ سۆزەم یەکتری ناگرن
بوومەتە دوو جەستە، جەستەیەک ئاوەز و ئەوی تریان سۆزە
لە میانی پەرەنگ و کڵۆ بەفری پەرۆ پەری ئاڵەکۆکە برینم
تا پەرەنگ دەسووتێ و بەفر ماڵاواییم لێ دەکا و دەبێتە شڵێوە
هەورەکەش دادەکا و لافاویش هەڵ دەکا تەمەنم دیماهی دەبەخشێ.

(٥)

چیا تورەیی خۆی لە دامێن دەردەکا و یەک پارچە ئاڵ دەبێ
ئورفیوس هاتەوە تەمبوری زمانی دەگێڕێ و بەرەگەز مرۆنە
ئیساکۆس دەگریێ ئەڵماسی چاوانی بەکوڵ نێو دەروونی دەسمێ



کچەکەم، زێدی خۆم نەمدەزانی دەبی بەگیای نەمری ون دەبێ
نەمدەزانی چرا لە ژوورم بۆ ئاوا خامۆشە و هەناوم داغ دەکەی
کچەکەم زێدەکەم، گریانی بەکوڵم دەریاکان لاڵ دەکا و وڵات هەڵدەکروزێ
دەوروبەر چۆڵ بووە، تەنهامە لەو ناوە وەرە نێو چاوانم
بوویت بەچی برینت ئاڵ بووە؟ گۆڕت هەڵکەندووە؟
ئیساکۆس دەگریێ ڕدێنی نوارنی تەڕ دەبێ و ئاگر لە سۆیانی بەر بووە

(٦)

ڕەوێ مەل درەختی ماڵەکەی منیان داگرتووە و ڕەنگی من پەڕیوە
کامیان خۆشەویست و گراوی منی خەو نەدیوە لەم ناوە؟
کامەیان قەندیلەی نووتەکی و تاریکی ژوورن با هەڵبچێ
کامەیان ئەسپی ژێر سواری ئەو دڵەی تەنگمە با تاودا
ڕەوێ مەل درەختی ماڵەکەی منیان داگرتووە و نافڕن
درەخت و دڵی من سنووریان نەماوە و پڕ بووینە لە جریوە
هەموویان برینم دەکەنە دیوەخانی گڕ و لەسەرخۆ دەسوتێم
گۆڕەکەم درەختە و ماڵەکەم گۆڕێکە و منیش هەم درەخت و هەم گۆڕم
گراوم مەلێکە تێکەڵی بەهاری دێ بووە ئێستا نایناسمەوە
سەوز هەڵگەڕاوە و تێکەڵی بەهاری دێ بووە ناو ناوە دەگریێ.
با ناڵەم تاڤگە بێ و بەتوندی ناو جەرگەی دۆڵەکان شەق بکا
دەنوکی سپییە و تێکەڵی بەفر بوو ئێستا نایناسمەوە
دەگەڕێم دەستم لە ڕیسی هەور گیر دەبێ و بارانێ دادەکا
دەیگەمێ و نایگەمێ، هەموویان باڵا دەگرن بۆ ئەوبەر
هەڵدەفڕن
کچەکەم باڵی گرت ئەوەتا شین دەچێ و تێکەڵی ساماڵی دوور بووە
ئەستێرەی خەفەتم ڕەهێڵەی داستان و ئەفسانە ونی کرد
دەنوکی سوور دەچێ و تێکەڵی ئاسۆگەی بێ پەنا و سوور بووە.

**١٩٨٩**





هەندێ جار لە باکوورەوە دێن
هەندێ جاریش لە باشوور
دێن... دێن... دێن
لە سەرەوە... لە بنەوە... لە ناوەندەوە... لە پەڕگەوە
جەستەکانیان هولامین
بەهەموو شوێنێکەوە دەچن
پیاوەکانی جەنگەڵ مایەی گریانن
پیاوەکانی جەنگەڵ مایەی پێکەنینن
تێرن... برسین
بلندن... نەوین
هەموو شتێکیان لا دەست دەکەوێ
ژەهر... گوللە
چەقۆ... شمشێر
تیر و کەوان
کۆت و زنجیر
بلندن... نەوین
بەڵام ئەوەی پیاوی جەنگەڵ ڕێی پێ نابا
پاکی و گوڵە، عیشق و ئەوین.

٢٠٠٠



## سوندسیەکان

(١)

کە ئێوە جێ دێڵم
ڕێبواری ناوەختەم لای ئێوە
هەر بۆیەش دەچمەوە لای گۆڕی دۆستانم
دەزانم ڕۆژێ دێ میوانی ئەبەدی ئەوانم

(٢)

تەواری تاوێر و ناوتەمی ترۆپکان
شەرمنن پەی نابەن بەپاوانی پیریم
کە تافتەی ڕۆحی خۆم لە چاویان شووشتەوە
بوومەوە مناڵەکەی جاران و
تک تک شیر لە گۆپکەی زمانم هەڵڕژا
چوومەوە یۆتۆپیای جارانم

(٣)

تاوێ باران لە تارای تابان بانگ دەکەم
وەرەوە مەرجانی ئاسمانی
بەرامە و بەهمەن و بادام و باقەبێن
داسماڵ و داب و دادی خۆمان
بەینەوە دارستان
لە مەستی مەلەی مانگ و
لە بادی بەهێدا باڵ بگرین
لە جوانی و جیلوەی جامی سەفا بخۆینەوە

(٤)

با له بالآم لوول دەم
کۆشێ له کراس و کینوالّی کێوەکان دەلوێنم
بۆ تەرمی تاگرتووی ئازیزێ
هاودەم بوو بۆ ڕۆحی شکاوم

(٥)

مشتێ ماچ له ماتابی مارسیس
بۆ دلّم دەهێنم
ئەو دلّەی شووشه بوو شاشەوقێ شکاندی
ئەو دلّەی له زەردێنەی زیبای زەهمان بوو
برینی بازوبەند بالّی کرد

(٦)

چەند چەمێ چەمانه له چوارینی چاوی چوارشەممه
دەنێرمه لای کچانی بابل
کچانێ بەتەنها دووجاران له دەرگه ترازان
جارێکیان ئاسۆیی شوو دەکەن
جارێکیان ستوونی که دەمرن
شای بابل بۆ خاتری ئەمیهیا نائومێدی کردن
که تووشی تەماشا و تەلاری میدیا بوو
باخی هەلّواسراوی بۆ بالآی دروست کرد



## فریاکەوتین ئەی دۆست

ئەی ماتەمترین ئازیز و ڕەوحانیترین شکۆدار
ئەوە چ قەدەرێکه خلودمان له بنی مەحالّ دۆزیبیەوە
لەسەر زەویمان فڕێدا
ئەی پرسەدارترین کاژ و پڕ شکۆدارترین زێوانم
ئەوە چ پەندێکه شەلآلّی شەهد و شەهادەت
له مەڕمەڕی جەستەکانی خۆمان نووسی و
بەپاچی ڕم و تیری گومان هاتین و ڕەشمان کردەوە
ئەی پەرۆشترین هاوڕێم و بێهوودەترینی هەمووان
که سەر و ڕیشت خەم نەبا عومر زەفەری پێ نەبوو
چەند حیکمەته
واز لەو شمشالّه بێنی و بیخەیتەوە کەمەری خۆت
که دەبینی ڕۆما گڕی تێ بەربووە و زەنگی کلّێسا گریانه
ئەوە نییه کتێبەکان کلّپەیانه
پیاوچاکانیش بەبالّی هەلّکڕووزاوەوە
له بانگی مناره نوورانییەکانەوە ڕادەکەن و
زەوی خالّی دەکەن له حیکمەت...
ئەی پەرۆشترین هاوڕێم و موغانیترینی مەستان
چەند حیکمەته دەست له گۆرانی هەلّگری و
له دوورەوە... سەیری
کۆشکه تاق بەرزەکانی قەلآکەی
دەلّێی پەیکەرێکن له سام و قەڕنەفولێکن له دووکەلّ...
ئەوە چ قەدەرێکه ئەو شاره هێنده هەناسەی سواره
فریا نەکەوتین ئەی دۆست پەنجەرەکان بکەینەوە...
تەیری کوێستانیش تێپەڕین...
چەند حیکمەته دەست لەو خەونانه هەلّگری که دەبینی

زولفەقارەکەی دیموکلیس بەسەر تەختی تەویڵتەوە
ئاهی کۆترە کێویلکەکان ڕایگرتووە
ئەی ماتەمترین ئازیز و ڕەوحانیترین شکۆدار
ئەوە چ قەدەرێکە دەستی ناوەتە نێو دەفەی ئەندێشەمان
ئاوا ڕۆحمان پروکاوە...
ئەی پەرۆشترین هاوڕێم و بێهوودەترینی هەمووان
کە سەر و ڕیشت خەم نەبا
عومر هەرگیز نەیدەبردەوە بەفرستان
ئەی قەدەریترین ئینسان

زستانی ١٩٩٣

## گەمەی دژەکان

بەسەر تەختە شەترەنجەکەی لاتین دا
شێتانە گۆرانی دەچڕی
بێهودە گەمەکانی خۆی دەکرد
گەمەییێک بۆ مەرجانەکانی خاک
یەکێک بۆ سەما
گەمەییێک بۆ درەخت و جوانی
یەکێک بۆ دەقێکی جاویدانی
هەموو سەربازەکانی تەیار کرد
سەربازێ بۆ دەرگای قەڵا
سەربازێ بۆ هێنانی ئاو
سەربازێ بۆ پەڕینەوە بەناو تێلدڕ
سەربازێ
سەربا
سەر
...
هەموو فیلەکانی خستە سەریەک
فیلێ بۆ تفاق و تۆفان
فیلێ بۆ گواستنەوەی شازادە
هەموو ئەسپەکانیشی زین دا
ئەسپێ بۆ حیلە و خرۆش
یەکێ بۆ تاودان
خۆشی بەسەر بیرە ئاوەکانی قەڵاوە
هاواری کرد
بەرەو مەیدان
بەڵام ئەژدیها هەر مایەوە





ئێستاش پێکەکانی خۆی هەڵدەدا
کشێ نەیتوانی تەخت و تاراجی وێران کات
ئەسپێ نەبوو بەکورژنێ پەلبەستی کات
فیلێ نەبوو بەکەڵبەی عاجی لوولی دات
بەتەنها سەربازەکان بەسەر خانە سپی و ڕەشەکانەوە
لە خوێنی خۆیان دەگلان
ڕۆخانە دوورەکان سوور دەبوون لە گەوهەری خوێن
یەکە یەکە
دوا ئاوڕیان لە قەڵا دەدایەوە
ئاوڕێ بۆ گوڵە جوانەکانی سەربانی قەڵا
ئاوڕێ بۆ دەروازەی ڕماوی قەڵا
ئاوڕێ بۆ کچە جوانەکانی بەر پەنجەرەی قەڵا
قەڵاش دوای ڕمانی وەزیرە جوانەکەی
دوای سینەی کون کون بووی مەلیک
تەنها... تەنها هەر بەتەنهایی مایەوە

## ئای دڵەکەم چەند خەمباری

*(بۆ سمایل بەرزنجی هەمیشە خەیاڵ)*

ئەگەر ساتێ لە ناو لەپی دەستم دەبووی
هەتا دەمتوانی دەمکوشیت
تاکو دەبووی بەدڵەکەی مناڵیم و
ئازادم دەکردی لە خۆم
ئای کە ڕقم چەند لە خۆمە
کە زیندانی ئەبەدی تۆم
کاتێ دەهات وامدەزانی
جەستەی خەونێکی شکاوە
ئاوێنەم پڕ لە شەوق دەکا
مەل بوون پڕاوپڕی باڵەکانیان
نەوای (نەی)یان بۆ دەهێنام
کۆمەڵێ سەوسەنی ڕۆح بوون
بۆنی چیا و کێوی دووریان بۆ دەهێنام
رەفێ کتێبی خەمگین بوون
کرێشمەیان پێ دەبەخشیم
دوور دوور دوور دوور
دەنگی دەف و دەفژەنی وان
هەڵدەڕژایە ناو ناخی من
ڕەنگی ئێوارەئاسایان
تێکەڵ بەڕەنگی من دەبوو
ڕەوێ نەیژەن دەتگوت پەرین
لە ئاسمانەوە هاتوونە
سەدایان کەونی دەگۆڕی
مەستیی حوکمی دونیای دەکرد



کەنیزە جوانەکانی ناو باخچەی سەما
گوڵجاڕێ بوون
وامدەزانی پارچەی مەرجانی شکاون
یا گەڵای زیوینی پاییز
بەسەر ئەرشی خوا ڕماون
تا دەهات تەم خەستر دەبوو
بەفر لە ناو شووشەی کەون
چاوی ئەسپیشی کول دەکرد
کۆمەڵێ تاووسی ڕێ بوون
باری ئەشق و ناز و فیزیان
لە سیروانەوە هێنا بوو
هۆرەی گەرمی فریشتەیان
لە هەورەماندا کڕیبوو
تەخت و تاراجی بابانیان
لەسەر سینەی پڕ لە شیری خۆ دانابوو
وەک ئاگر
نەء وەک شمشێری ئەردەڵان
لە ناو لەعلی ئەنگوستیلەکەی میدیاخان
وەک نالی دەبریسکایەوە
بەپەلە
وەک تاوێ بارانی ناکاو
چوومەوە ناو خەڵوەتی کتێب
لاپەڕەی ئیشقم کردەوە
ڕستەکان هەڵسابوونە سەرپێ
یەکەم ئاگردانی من بوو
دوا چرەدووکەڵیان لێ هەڵدەسا
دوا ڕەوە مەلی ئاسمانی مێژووی من بوون





تازە زمانی گریانیان
لە گومانی هاملێت دەپژا
دڵشکاو وەک گۆزەی شکاوی خەیام
چوومەوە بەر ئاوێنە
بەهەناسەی سارد
بەدەنگێکی کز و ماتەم
گوتم خەمبار مەبە دڵەکەم
تیشکێ لە ئاوێنەی کتێب هەڵسا
کەون یەکپارچە بوو بەزیو
زیو هەمووی ئاگری گرت
وەکو ڕۆحی من تاواوە
بوو بەشمشێر
بوو بەئاگر
زەردەشت لە دەخمە هەڵساوە
ئاگردانی گەش کردەوە
یەکەم پێکی خۆی هەڵقوڕاند
مەلەکان هەمووی بوونەوە
دەفڕەن دەتگوت ئاڵەکۆکن
لە ژێر بەفر هەڵدەسنەوە
کەنیزە جوانەکانی ڕۆح کەوتنە سەما
نەیژەن لە فیراق هاتنەوە
هاوارم کرد هێی دڵەکەم
دەرگای زیندانم واڵایە
دڵ لە شەققەی باڵیدا فڕی
ئێستا تەنهاترین کەسم لەم زیندانە
دوا پێکی خۆم دەخۆمەوە
هاکا بەرەو دوا نیشتمان شۆڕ بوومەوە



## ئەو ئاگرە داگیرسێنەوە مێرێ

هەمیشە لە باخە دوورەکانی دڵ ئاگرێ هەیە
ناهێڵێ جوانی بمانکوژێ
هەمیشە لە نێو خەرمانە شینەکانی دەنگ گڕێ هەیە
ناهێڵێ کپیی وەک مەرگ هەڵمانمژێ
کە ئاگرەکانمان کز دەبێ ئەوە خوێنمانە وشکەبێ
کە ئاگرەکانمان گەش دەبێ
ئەوە دڵمانە لە ناو ئەویندا دەپشکوێ
ئاگرەکە مەکوژێنەوە مێرێ
با هەر لە داگیرسانا بێ
کێ ئەوەندەی ئێمە لە کلێپەی ئاگر دەگا
ئێمە بەو کلێپەوە ماوین
یەکەم جار باپیرە دوورەکانمان خۆیان پێ داڕشت
کە بەئێمە گەیشت نەوەییێکی پەرتەوازە بووین
یەکتریمان نەدەناسییەوە
ئاگر بوو هەندێکی وەک پەمۆ لە باکوورەوە هێناوە
هەندێکیشی لە باشوور
باڵێکی لە خۆرهەڵاتەوە هێنا
باڵێکیشی لە خۆرئاوا
ئێستا هەموو جەستەمان ئاگرە ئاگر
کە دەست بەرز دەکەینەوە
هەموو کوورە ئاگرەکانی زەردەشت دەبینین
کە گۆرانی دەڵێین
هەموو پەرییەکانی میدیا سەما دەکەن
کە شین دەگێڕین
هەموو مردووەکانمان زیندوو دەبنەوە

هیچ ئاگردانێ ئەوەندەی ئاتەشگەدەی ئێمە
وەرنەوە شەوقە جوانەکانی نەرگز
بۆ دەم کەنارەکانی خودا بەرنەوە
وەلێ هاوارەکانم لە زمانم ڕەت نەدەبوون
وردە وردە جوانییەکان هەڵدەپرووکان
کەون ڕەش هەڵدەگەڕا
ئاگرەکان دەکوژانەوە
بوون دەتوایەوە
دڵۆپ
دڵۆ
دڵ
د
ورد و خاش دەبوو
ئەمە ئەفسانەی دوای نەمانی جوانییەکان بوو
ئەمە ئەفسانەی دوای کوژانەوەی ئاگرە جوانەکان بوو



## کتێبی خوڵقان

پەنجەرەی تاقبەرزی دڵی خۆم کردەوە
هەر ئەڵێی لەم دیوی دونیایە
دونیایێ لە تەمی خوڵقان و لە شووشەی خودایی
دونیایێ لە خەونی خەڵوەتی ئەشکەوت و
پڕوشەی غوربەت و تەنهایی
دونیایێ لە چرای شکاوی چاوی مار
فریشتەی جەستەی با وەک کچێ چل کەزی
کە باڵای لە ئاسمان تا زەوی درێژ بوو
کەزیشی بەتاشە و تاوێران دەکەوت شەوئاسا هەڵدەخزی
وەک فەنەر، چل چرا و شەوبۆی نوور
وەک ئاسک، کراوە وەک تاووس
لە پەڕی مراوی و لە جەستەی ئاهودا
هەمایون و هەوری هومایی
بێ پەروا لە پەردە هاتە دەر فریشتەی خودایی
با بوو با هەڵیکرد
باران بوو ئەباری
گزنگ بوو هەڵئەهات
شمشێر بوو بروسکەی هەڵئەچوو
نەغمە بوو ئەو ناوەی پڕ ئەکرد
خەیاڵ و تارمایی
هەم خەون و ئاگایی تێکەڵبوون پێی گوتم
عومرێکی درێژە لەم تەلانە ڕکە وەستاوم
هەزاران هەزار جار بۆ خەرەندی مەرگ ڕماوم
بەڵکو جارێ تەنها جارێ پەنجەرەکەت بکەیتەوە
منی بای ئاسمانی بێمە ناو دڵتەوە





تا فێر بم چۆن چۆنی ئەوەندە پڕ مەیل و فراوانی
ڕامانت لە ڤالآی خەڵوەتێ دەکاتن زۆر هێمن
هێمنی درەختێ کە بەرەو ڕووی پاییز دەچێت و ڕادەبێ
هێمنی لیمۆیێ کە لەبەر بای سپێدان زەرد زەرد هەڵدەگەڕێ
پێی وتم چەند ساڵە تۆ لە پشتی کێوی شووشەی ئەم
زیکرەوە چی دەکەی؟
ڕازی خۆت بۆ کێ هەڵدەڕێژی؟
هەر ڕۆژە سەرت لە کتێبێ سپی بوو
هەر شەوە دڵت لە ئەوینێ تەڕ دەکەی
هەر جارەی کتێبی سەر ڕانت ماچ ئەکەی
هەزاران فریشتە بۆ ئاسمان هەڵئەچێ
عومرێکی درێژە نووری ئەو یەقینە لە ڕۆحت هەڵئەچێ
نازانم تۆ ڕووەو فەنابوون بوویتەوە ئاوا جاویدانی
یا بەرەو خولقاندن ڕادەکەی؟
هێند بچووک بوویتەوە خەریکە نەتبینم
هێند گەورە دیار دەدەی چاو بەشی بینینی تۆ ناکات
ئەی پیر بەری ئەو نوورەی خۆتم لێ مەگرە
من بام بای ئەزەل
ئەگەر یەک تروسکە لەو نوورەم پێ بەخشی
تا ئەبەد ئەو سەدیمە لە نوور غەرقەبێ



## مارکۆپۆلۆ

خەزنەیێ بوو لە ئاگر
بەشی هەموو دنیای دەکرد
سەبەتەییێک بوو لە سێوی ئارەزوو
بەسەر هەموو عاشقەکانی دەبەشیەوە
وەکو باییێکی پیرۆز
وەک زێماریێ
کەس نەیدەزانی
لە کوێوە دێ و بۆ کوێ دەچێ
وەک ناڵەی فیراقێ لە شمشاڵەکەی مەولانا
هەمیشە و بێ وچان خۆی لە قەدی سەفەر لوول دەدا
هەمیشە لە کڵێسا دێرینەکان دەوەستا
سەرسام وەک سەرسامی لوتکە بەدیار بنار
خۆی و دەفتەرێ بەقەد ناولەپی
قەڵەمێ لە مەرەکەبی چینی
چاویلکەیێ لە شووشەی سەمەرقەند
بەسەر تابلۆکانەوە دادەگیرسا
کاتێ لە یەمەن هاتەوە بۆنی قاوەی لێ دەهات
لە دوورەوە سلاوێکی کرد و شەبقەکەی نایەوە
باوەشێ ئارموشی بەختەوەری لە ئامێز نابوو
سەرانسەری دونیا گەڕا
ئەو بەختەوەرییەی هەر تەواو نەبوو
کاتێکیش بەسەر گۆڕەکەی حافزاد
سەیری لوتکەکانی ئەلبورزی دەکرد
شیراز بوو بەکۆترێ
لە شەققەی باڵی دا





بەرەو نیشتمان هەڵفڕی
نیشتمانی ئەو دۆڵێ بوو یا ئەشکەوتێ
یا دێرێکی کۆنینەی سەدەکانی ناوەڕاست
یا دەروازەی ڕماوی قەڵایێ
یا کتێبخانەییێکی دێرینی بابلییەکان
یا باڕێکی گەرمی هیندۆسەکان
زانی دونیا لە دوو دەرگادا ناترازێ
یەکێکیان پیایا دەچیەوە ناو ڕۆحی ئاو
یا ڕۆخانەی تەرمەکان
یا گەلەرییێکی پڕ ئێسقان
لەویتریان دەچیەوە ناو بەفری سپی
کفنی سپی
یا ڕەوەزێ لە تەمتومان
مارکۆ هەمیشە وەک مەلێ دەچۆوە سەر هەموو درەختێ
وەک خۆرێ دەچۆوە سەر هەموو سپێدان
وەک ڕەنگێ دەچۆوە سەر هەموو تابلۆکان
وەک دایکێ دەچۆوە سەر هەموو گۆڕەکان
نهێنییەک بوو لە ناو قوتی ئاشکرایی
ئاشکراییەک بوو لە ناولەپی نهێنی...
هەموو دونیا گەڕا
بەڵام ئەوەندەی من قوڵایی دەریای نەبینی
ئەوەندەی من پەڕەکانی نیلۆفەری نەخوێندەوە
ئەوەندەی من بەسەر باڵای کۆشکە هەڵواسراوەکان نەکەوت
ئەوەندەی من سەفەری نەکردە ناو کوپە نهێنییەکان
ئەو سەدەفە جوانانەی لە لێواری دەریاکان هێنابووی
ئەو هەموو عاجە سپییانەی ناودەمی فیل



ئەو بەهاراتەی لە خاکی سندا هێنابووی
ئەو تەڵەسمانەی دیوارەکانی چین
کە گەیشتەوە نیشتمان
بەیەکەوە کەوتنەوە ناو
گۆڕێکی قووڵ
گۆڕێکی دوور
گۆڕێکی تا ئەبەد تەژی نوور

## قاپێ مەحاڵ

دوای ئەو تۆفانە تووشەی
کە هەموومانی لە لیم خنکان
دوای ئەو ڕەشەبایەی
هەموو گوڵەکانی گەنجی بردین
وەرە با یەک دوو قسەت بۆ بکەم
ئەی دێرینترین دۆست... وەرە
بمگۆڕە ئەو دڵەی جارانم پڕ بووە لە یادی تاڵ
یادەوەری شکست و مەینەتی
نەوای ورد و خاشبوونی ئاسۆکان...
تەقینەوەی زێماری ئەزەل
یادی ونی و سەختەندازی
دڵێکی ترم پێ بەخشە لە گوڵ و ئاو بێ
شەوان خەون و چل چرا بێ
سروتی تێکچڕژانی دەنگ و سەدا بێ
شەپۆلە نەرم و نیاکانی ناو تەمتومان و سەما بێ
تا بتوانم بەرگەی ئەو زەمانە بگرم
نهێنییەکان بەدەست بگرم
تا بتوانم لەگەڵ برین ڕابێم و
لەگەڵ ئاگر دۆست بم
لەگەڵ باران قسە بکەم
تا بتوانم لەگەڵ بروسکدا بژیم
بمگۆڕە خوێنم بگۆڕە و بیکە بەئاوی زرێبار
گوڵی جوانی تیا مەلە بکا
بیکە بەئەرخەوانی ژێر ئەستێرەکان



مانگەشەو لە سێبەریا
بەڕووتوقووتی سەما بکا سەما
خوێنێکم بدەرێ لە خوێنی فریشتە بچێ
لەگەڵ هەموو خوێنێ تێکەڵ بێ
حەز لە تیشکێ دەکەم بەسەر دەریارە هەڵێ دەریا
کەنارەکانی جوانی ببینم
ڕۆژێکم بدەرێ سەما بێ بەسەر لێواران... سەما
پەیکەرێ بێ لە ماچ بەسەر دونیادا بباریێ
حەز لە گۆرانییێ دەکەم ونبووەکانم بیربێنێتەوە
دەرگاکانم بۆ بکاتەوە
بمگۆڕە ئەی جوانترین تابۆ بمگۆڕە
چاوێکی ترم پێ بەخشە تا قوڵاییەکان ببینم
دەستێکی ترم پێ بەخشە تا گوڵێکی دیکە بچنم
قاچێکی ترم پێ بەخشە دوورتر بڕۆم
من شەیدای شوێنە دوور دوورەکانم
دیارن و دیار نین
چاوێ تەنیا جوانی ببینێ
دەستێ تەنیا بۆ تەوقە بێ
قاچێ تەنیا بۆ سەفەر بێ
بمگۆڕە ئەوەندە نەماوە بڕستم لەبەر ببڕێ
ئەمەوێ بچمەوە ناو ئەفسانەکانی منالّی
ناو باخەکانی تەنیایی
کە لە سێبەرە شینەکانیان
ملیۆنەها ڕاز و نیازیان شاردۆتەوە
ئەو باخە دوورانەی
هەموو شەوێ خەونیان پێوە دەبینم

بەڕۆژیش نایاندۆزمەوە
ئەو باخانەی وەک شووشە
لەبەر باران دەدرەوشێنەوە
بمگۆڕە ئەی جوانترین تابۆ
بمگۆڕە بمکەوە منالّەکەی جاری جاران



## غەرق بوون

شەکەت بوو
وەک دلّۆپێ شەونمی دارکاژی چیایان
بەستەیەک ژەهر بوو دەیچڕی
مسۆگەر دەیزانی بۆ مەرگە
کەوتە سەر زەمین و لەت لەت بوو
ئاسمان پڕ بوو لە تروسکەی لەشکر و بروسکەی شمشێران
هەر سوار بوون لە تۆزی شەڕی تووش خلّتانی خوێن دەبوون
هەر ئەسپی سورخن و کورژنی پڕ سام بوو ئەو ناوەی داپۆشی
تەرم بوون گەردەنیان وەک کوانوی زستانی قەیسەریان سوور دەچوون
مەولانا هێند بەکولّ دەگریا سەری خستبووە نێو چیای زۆر ڕکی ئەژنۆکان
ئاسمانیش پڕ ببوو لە کۆتری فرمێسک و تفتیلکی هەنسکی
مێژووی خۆم دەبینی وەک زۆرانبازێکی هەموو لەش بریندار
وەک کچێ لە ڕامووسانێکی بەخورتی و دەست بەستە
شەکەت بێ فرمێسکی هەلّدەڕشت
زریبار لاوکی دادی خۆی ڕادێشتە ناو هەتاوی ورمێ و شەق دەبوو.

## ئاوێنە

ئاوێنەیێک بۆ تۆ قووڵایی جوانییەکانی خۆت بینی
پەڵەبارانێ بۆ خاک تا بۆن و بەرامەی نەمری بدا بەئێمە
ئاوێنەیێک بۆ من تا لە تەمتومانی گیانم تۆ وەکو مانگێ
ببینم
کانییێ گەوهەر بۆ ئەو تا لە مانگی ڕۆحیا تریفەرێژمان
بکات
ئاوێنەیێک بۆ هەمووان تا نووری هاوار بەدی کەن
شووشەیێ نوور بۆ دڵ
گوتم دەشتی پەنجا ساڵ کەم نییە
تۆ لە بەردەم دڵۆپەی گەرمی غەریبی وەستاوی

پەنجا ساڵ کەم نییە
لە بەردەم ڕێژنەی بروسک و بارانی شیعردا
سەیری تابانی خوا دەکەی
پەنجا ساڵ کەم نییە
تۆ بەدوای ئاگرێ دەگەڕێی
نە تیشکی دیارە و نە خۆڵەمێشی گەرمی جێماوی
هەمیشە عەودالّی ئەو ئاسکەی ڕادەکا و ڕادەکا
تا تێکەڵی سەوزەگیای شاخ دەبێ و ون دەبێ
بۆ ئەبەد بەدوایدا گڕ دەگری
هەمیشە بۆ دەنگێ گوێ دەگری
دەبیستی و بەدوایا وێڵ دەبی
نازانی لە کوێوە هاتووە و چی دەڵێ
پەنجا ساڵ کەم نییە
تۆ هەموو ئاوێنە جوانەکانی ڕۆحی خۆت بەشیییەوە



ئەوێستاش بێ ئاوێنە و تەنهای
ئەو دەنگە هاواری سێوێ بوو
لە دەستی کچێکا
بێ دەنگی هێشوێ ترێ بوو
بەسەر تەونی گەشتی پەلکی عەتراوی مێوێکا
چوومەوە وڵاتی ئاوێنە و خۆم دواند
وەک کەسێ بۆ ساتێ خودی خۆی ناسیبێ
وەک کەسێ پێی وابێ
هەر خودی خۆیەتی کە کەون
جگە لەو کەسێکی ئاوەهای بینیبێ
تۆ کێی ئا تۆ کێی...؟
وا هێندە عاشقی ڕوخساری خۆتی لالۆ
لەبەر خۆت نە کەسێ دەبینی
نە کەسێ دەناسی
ئەمەیان دەنگێ بوو وەک گلە و گازاندە
کە پرس لە باخی نەی دەکا
ئەمەیان نەوای شەوێ بوو کە هەنار شەق دەبێ
لە بای وەشتی دەکا
هەر کاتێ دەچوومە بەر ئاوێنە و سەیری خۆم دەکرد
بەدەنگێ وەک بلێی
لە قووڵایی زەوی هەڵچوو بێ
یا لە درزی شووشەی شکاوی ئەفسووسێ
یا لە نێو گەوەڕی ئەشکەوتێ
دەیچرپاندە گوێم و پێی دەگوتم
کوڕەکەم تۆ هێندە لەبەر ئاوێنە مەوەستە
هێندە سەیری ڕوخساری خۆت مەکە

ئەگینا دەکەوییە غەریبی
قسەی ئەو نەخشی سەر بەردان بوو
تەونە جوانەکانی کاشان بوو
نوێژی بووزا بوو
دووزەڵەی داود و
نقێمی ئەڵقەکەی ناو پەنجەی سولەیمان بوو
کەچی من ئەوەندە سەیری ئاوێنەم کرد
جێ نەما لە ڕۆحم بەبرینی نەزانم
جێ نەما لە ئادگار و شێوەم
بەئاسۆی خەمگینی نەکەوم
من هێندە سەیری ئاوێنەم کرد
تا لە ئاوێنەدا ئاسێ بووم
ئیدی بۆ ئەبەد نەمتوانی
لە ناو جیوەی دڵی قوتار بم
ئێستاکە من خەمگینترین ڕوخساری سەر زەویم.



## بوراق

ئەسپەکەم تاپۆی بوون و مانم ڕێکەوە
ئەم هەورە تووڕەیە ڕێی داوە
تاسەیێ دەروونم دەسمێ
ئاگری چیایان لە پێدەشتی دڵم بەردەدا
بژیشت لە خەنەی ساماڵە
دڵیشت بۆ هەوای کوێستانان
هەناسەی ئاگرین سەردەدا
دەزانی ماڵاوایی سەختە و
ڕێگە و بان سەرما لوولی داوە
جا بۆیە شەڵاڵی خەم بووە ئەم چاوە
ئەو ڕۆژە بەفر بوو
سواریش ئەسپیان لە تەوێل بەستەوە
ئەو ڕۆژە بەفر بوو
گوندینیش چوونەوە کوختی بەر چیایان
دەچووین و ئەسپی خۆم تاو دەدا
پێم دەگوت ماڵەکەم ڕێکەوە
ڕێی دوورمان باڵێکە و
ماندوویی چاوی تۆش شاباڵێ
پێم دەگوت ئەسپەکەم لە بیرتە
بەسەر پشتی تۆوە گەردەنم ماچ دەکرد
کریڤ و سامانم لە بیرتە
سەفەرمان ئەودیوی چیا بوو
زریانیش تا دەهات دایدەکرد
ئەسپەکەم ڕێکەوە
سەفەرمان یا هاتە یا گرۆی پاییزی نەهاتە





له خەمی چاوانت دەترسم
نەهامەت دیارە
بروسکەی سمیشت
گرێکە لە درەختی پیری برینم دەئاڵێ
ئەسپەکەم زیندەگیم
کریڤ عاشق و بنەچە و باوانم
مناڵ بووم تۆم هەبوو
ئێستێکەش بۆ ڕێی دوور تەگبیران دەنێرین
سەری خۆم داوەتە پروشە و
دەزانم دوو مێوانی تەنهای زریانین
سەیر کە دڵۆپی فرمێسکی چەند وردە؟
هی ئاسمان هەر دەڵێی لافاوە
ئەسپەکەم باوکەکەم ڕێکەوە
تا ڕێ و بان دیارە و دوا نیگام لە چاوە



## یادستان

ئێستاش ئەو گۆڕە
هەر بۆنی برین و پروشەی خوێن و چۆلەکەی لێ دێ
ئێستاش تاوێر و تیشە و دامێنی
بۆنی هەوێردەی زەردی بروسک و
گریەی ئەشقیای بێ دەنگی لێ دێ
ئەو کاتەی ئاسمان تریشقەی هاوێشت
هاواری مەرگی من بروسکاندی
دونیا پڕ بۆوە لە گەڵای باران
مەلی جریوە زەوی داپۆشی
بولێڵی دڵم، سینەی کون کونم
زەردەپەڕێکی چیاییان گرت
هەر بۆیە ئێستا هاڵاوی ئیشقم
گریەی ئەوینم ڕێ دەسووتێنێ
خەنجەری گریان لە کاڵانی چاو دەردەکێشێت و
خوێن دەدەڵێنێ
ئەو ڕەوە سوارەی کە گەلی ئاسۆ و تەنگەی خەرەندیان
بە زرمەی شمشێر، بەسمکۆڵی پێی ئەسپە کێویان
بە حیلەی ماین پڕ کردۆتەوە
تەنها سووتاوی ڕۆحی شەکەتی هەوڕاز برانە
ئەوسا من و تۆ لەو دامێنانە
بۆ دەمی چرا و کانی ئاواتان شۆڕ دەبووینەوە
لە نێوان نسکۆی بەردی بن مێژوو
ستێر بارینی دوورە ولاتان
لە مەرگی کپ و لەسەرخۆوەڕا
بەرەو مردنی توند گوڵمان دەگرت

هەر ئاسکی شاخ و بەهێی لێوار و ماینەحدود بوو
سینەیان دەبووە نەرگزەجاڕی دەشتایی هیرتێ
هەر ئەسپی سوور و بەڵەک پەمەیی و سواری ئاگربوون
لە خوێنی برین هەتا گەردنیان نقوم باردەبوون
ئەوسا من و تۆ لە بۆشایی بوون
لە بێ ئومێدی بێ ڕەزم سەروا
شۆڕ دەبووینەوە ناو ئەو خەرەندەی
کەوا ڕووباری ئازارەکانی ڕۆژهەڵاتیمی بەسەردا دەڕوا



## تاووس

(١)

تاووس خان گوڵی مەریەمە و لە قاوەی مەرگ دەپژێ
تاووس خان پەری تەمگرتەی جنۆکانە
بەهەموو شت خەنجەر لە سینەی ڕووناکا
زۆر کەڕەتان گومان لە سایەی چل کەزی
گەوهەرپژی ڕژاوی سەر شانی دەکا
لە ئێوارەی گوندی پەرییان خوڵقاوە
خەمگینی لە چاوی مەنگی سارەئاسای
کەڵەکێوی دوور هێناوە

(٢)

تاووس خان قەفتەی خەنجەری
شیرڕێژکراوی مەبەست بوو
لە ژەهری دڵێکا خەم ئامێز و مەست بوو
لە هەوری گومانا پەرچەمی دادێنا
لە ئاوێنەی کپی بارانا
سینە و مەمکی سرکی خۆی دەشوشت
لە چرای شەبەنگی ئێواران خۆی دەکوشت

(٣)

تاووس خان
لە قووڵایی کانی غەیبستان پەیکەرم بۆ کردی
لە ڕەزی پەرییان تۆی لالەم دزییەوە
دەرزی نەزرم پێ هەڵگرتی
پەژموردەی خوناوباری گیا و کارەسات
لە ون بوون پەنجەرەم

بۆ لە مینای یۆنان ساز کردی
– وردبەوە لە سیمای خەمڕەنگی ئەم سوارە
توێڵی تەختی شاژنێکی نەهەنگە

(٤)

تاووس خان؛
پەریستان خەونێکی بچووکە بێ دەرگا و پەنجەرە
نە دەریا دەروونی دەسمێ و نە تاقی بەرز و دوور
نە لوتکەی دیارە و نە تەمی سەر باڵای زراڤی کۆساران
چراشی سیناهی نابەخشێ
زەویشی بێ بەشە لە عەتری خەمکوژی دوای باران
ئەوەتا سەبەتەی گوڵ فرۆشەکانیش
لە بەردەم کڵێسا نقومی تەمتومانن
لە شەبەنگی چاوی زێدی تۆ
گیرۆدەی دووپشکی گومانن

(٥)

ئوڤیلیام بەگەڵای سەوزی ژێر ئاوانم چواندی
لە درەختی هەزاران لقی بەرباران
سێوێکی نێولەپی (حەوا) بووین
ئەوەتا ترازاین پێکەوەش هەر بەندین

(٦)

تاووس خان
ئێوارە چوومەوە ناو شاری پەرییان
شاپەری تەوێڵی ماچ کردم
دەرزییان لە پێستی لەشم دا
چی نهێنی هەبوو لە ئەفسانەی خۆیان



هەمووی بۆ باس کردم
شەو ڕابورد بەیانی هاتمەوە
وامزانی مەلی بەربارانم
دەرزی لەش ترازا خەونێکی سەد ساڵ بوو
هاتمەوە سروشتی جارانم

## مەیلێکی درەنگ وەخت

ئەوین پێویستی بەتازەبوونەوە هەیە
ئەو دەنگە هی هەنارێ بوو
بەدیار شەونمەوە شەقی برد
هی تەوارێ بوو لەسەر فەرشی بەفرێکا
پەروپۆ دەبوو
تۆ تەوتەمێکی لە شووشە ناتوانم بتکوشمە باوەش
دەترسم ورد و خاش ببیت
خەونێکی لە نادیاری ناتوانم تەفسیرت بکەم
دەترسم ئاشکرا ببیت
چۆن چەپکەنەت کەم ئەی با بای ئەزەل و جاویدانی؟
تاوێ لەگەڵ خۆتم هەڵگرە و پەرش و بڵاوی دونیام بکە
وەک چۆن گۆڵ گۆڵ بۆنی نەرگزەکان هەڵدەگریت و
بەسەر دونیای دەبەشییەوە
وەک چۆن چیا چیا سیمای درەختەکان لە ناو دڵتا
دەشۆیتەوە و
دەیبەخشی بەدارستانان
وەک چۆن نهێنی عاشقەکانی بەرباران جانتا جانتا
هەڵدەگریت و
دەیکەی بەکتێبی گۆرانی
تاوێک هەڵمگرە ئەی با بای ئەزەل و جاویدانی
تۆی بەتەنها تۆی کە بتوانی رزگارم کەیت
لەم وەرەسیەی تاڵیشکە و بەرۆحمەوە نووساوە
هەر تۆی تەنها کە بتوانی حەشارم دەی
لەم قەدەرەی تیایا وەک نەورەسی بەربەیانان ئاسێ بوویمە
هەزاران ساڵە وەستاوم





دەمەوێ تا ئەبەد دۆستی تۆ بم
تۆزێ لە سورانەوەی ئەبەدیم بەدەوری قەڵا رزگار کەیت
کە خەریکە ژمارەی خشتی تەک تەک تەلارە رماوەکانی
ئەزبەر بکەم
«قەڵا من لە تۆ وەرەس نیم من کەڤنارترین عاشقی تۆم»
بەڵام ئەوین پێویستی بەتازەبوونەوە هەیە
قسەکردن لەگەڵ با تۆزێ ئەفسانەی پێ دەوێ
بەیەکەوە ژیان نەفەسێکی تری داوایە
ماسی پێویستی بەئاوگۆڕین هەیە
مرۆڤیش تا دەمرێ مەیلی هەواگۆڕی دەکا
ئەمانە قسەی پیرێ بوون لە نوور
قسەی تاوێ باران بوو بەر لەوەی بگاتە زەوی
ئەی با بمبە بۆ لای جوانییەکان
ئەو جوانییانەی دیدالوس لە تاوان
دوو باڵی بۆ خۆی داهێنا و لە ناو خۆردا توایەوە
بمبە بۆ لای ئەو کەنارانەی پڕن لە مەل
پڕن لە گەوهەری مانەوە
من قسەم لەگەڵ بەهێ کردووە مۆڵەت لە درەخت وەرگرێ
قسەم داوە بەرووبار شەپۆڵەکانیم پێ بەخشێ
بەقەتێکانم گووتوە تەگبیرم لەگەڵ پۆرەکان کردووە
بەلایاندا تێبپەڕم
ئەی با رێگاکانم دوورن دوور
دەچنەوە ناو گەڕەکەکانی مێژوو

## دۆستێ هەمیشە چاوەڕوانمانە

بەو دڵۆپە برۆنزییانەی لە زمانییەوە هەڵدەڕژان من غەرقی ئەبەد دەبووم
بەو عیترە جاویدانییەی لە دیدگای پڕ شەوقی ئەودا دەپژان
بۆ تا هەتا
نوقمی خەزەڵی درەنگ وەخت و سیحری ڕووناکایی دەبووم
کتێبی ڕۆژگار بوو موجیزەی بووزایی
تەژی بۆراقی دانتی و شیری شکاوی جەنگاوەر
تافتەی سەر سینە و مەمکی سنەوبەر
جواناوی گورجیان، تەوێڵی پڕ شەوق و بەرقی کەرەندی
ژەهری هەلا و ئەشکەوتی ترس و ئەفسانە
بخوردی گۆڕستان
ئەو ئەسپانەی بژیان لەبەرباران دەشووشتەوە دەبوون بە ئیکسیری ڕۆحم
منیش نە ڕۆحم دیارە نە ئەویش دێتەوە پەنجەرە دابخا و کنێرەکان ئاو بدا
یا وەک خودا کتێبێ بداتە دەستم و
پەرداخێ پڕکا لە سەفا
دەزانم کەسێ هەیە لە غەیبەوە بەدەنگێ وەک شکانی شووشە
وەک شمشێرێک لە تاریکایی ببریسکێتەوە منیش لە ڕووناکایی بلەرزم
هەست دەکەم نوورێکم هەر جارەی لە تەوق و پابەند و ئەشقبەند
چەهچەیەکم لە خڕخاڵی نەمری و لە شەوقی بازووبەند
وەک هەنارێ لە لقێ داگیرسێ و دنیا سوور سوور هەڵگەڕێنێ

بانگم دەکا...
ئەو بانگە شمشێرێکە لە شیر
شیرێکە لە شا
شاییێکە لە شێر و شەونم
دڵۆپ دڵۆپ دەرژێتە سەر ڕۆحی شکاوم دڵنیام هەرگیز نایبینم
ئەو کاتە نەبێ کە چاوانم کز بووە و سەریشم پرۆشەی بەفر
هانا بۆ کێ بەرم ئەی دۆست...





تۆ نەبی ئەی مەرگ کە لە وجوودی زەوی ڕەشم دەکەیتەوە
ئاخر بەم دوو باڵی شکاوەوە دەگەینە کوێ؟
وەرە بمکوژە... دەگەینە کوێ کە خۆت لە لەپم شاردۆتەوە
ئەی دەنگی شکاو و عومری بەسەرچوو، ڕەونەقی ئاقیقی خوێنین
تەمی بەناو لوتکە ڕژاو، باڵ شکستە، شەونمی سەر پەلکی برین
خەمی بەناو دڵان پژاو داڵی کەمین، تەوتەمی پەرستگای ڕماو
من لە پانتایی بادا ڕاکشاوم هاوار دەکەم
ئەی با... ئەی با... ئەی با
بوەستە
ئەوە چ کۆمێدیاییێکە ئێمە لە ناویا دەگرین؟
ئەوە چ تراژیدیاییێکە ئێمە لە ناویا دەخەنین؟
بێ ئەوەی چاوەڕوانی کەسێ بم، گوێ لە هاوارم بگرێ
دەزانم کەسێ لە ناو دەرزی ڕۆژگارەوە بەحەسرەتەوە بانگم دەکا
بانگێ لە بەشینەوەی کوڵێکی سێو دەچێ
کە هەرگیز بەر من ناکەوێ
بەڵام ئەفسووس لەو ساتەوە دەنگی ئەو بانگە نابیستم کە
لە من نزیک بۆتەوە
شکا... شکا دڵنیام لە ورد و خاش بوونی
ڕما... ڕما دڵنیام لە وێران بوونی
وەری... وەری دڵنیام لە زەرد هەڵگەڕانی
دەرگا بوو بۆ ئەبەد داخرا
درزێ بوو لە ڕۆحم تا پای مەرگ بەو درزە دەناڵم
سەما بوو... سەما بوو، قەفقاسی
مناڵی لێ سەندم
گەنجێتی لێ بردم
بەیداخی پیریەتی دا دەستم
وەرە ئەی دەنگ
ئەوەتا ئاڵای سەری سپیم بەرزکردۆتەوە و خۆم دا بەدەست.

## ئەفسووس دڵەکەم

وەک کتێبێکی کۆنینە کەسێ نەبوو تاقە جارێ بتکاتەوە
ئەی نامۆترین سروتی جاویدانی
کە لاپەڕەکانت پڕن لە گەوهەر و حیکمەت
ئەفسووس جارێ نەبوو پێم بڵێی
چۆن ئەم هەموو وەحشەتەت لەم تاریکستانە بەسەربرد
کە سپێدەیێک بەیانی باشی لێ نەکردی
پەنجەرەیەک بۆنی نانی گەرمی بۆ نەهێنای
کەسێ نەبوو دڵی خۆیت بۆ بکاتەوە
پۆستەچیێ نەهات نامەیێکی تۆ بهێنێ
چون دیەکانت کوێر نەبوون کە کۆترێ لە بانێژەوە
کاسەیێ گمەی خۆشی بۆ نەڕژتی
ڕیشۆڵەیێ بەسەرتا ڕانەبرد
کەسێ خەونێکی بۆ لێک نەدایتەوە
ئەی وەحشیترین عاشق چۆن نەسووتای لە تەنهایی
کە شنەیێک نەبوو بۆنی چیات بۆ بهێنێ
کچێ نەبوو تەونێکت بۆ بنەخشێنێ
چۆن شەوقی ئەو هەموو فرمێسکەت چەپک کرد
کە نەرگزێ قژی خۆی بۆ نەکردیەوە
وەی درێغا جارێ نەبوو پێم بڵێی ئەی وەحشیترین عاشق
چۆن جێی ئەو هەموو ئازارەت لە ناو دڵی خۆت کردەوە
کە بەقەد تیلمە گۆزەیێکی شکاوە
قەترەیێ مەی خوشی نەکرد
ئای کە شەوێ نەبوو پێم بڵێی
ڕۆشتی و گۆشەگیریت کردە وڵات
مناڵەکان هەمووی گەورەبوون



بەسەر گیای سەر گۆڕەکانەوە یاریان دەکرد
کە هێشتا لیمۆ بەسەر درەختەوە زەرد نەبووبوو
گەنجەکان هەمووی پیربوون
لە تەک دارەبازەکاندا دەخەوتن
رووبار تێر کەمەری کاژی نەکوشی بوو
پیرەکان هەر هەمووی مردن
هێشتا پاییز تەواو نەگەیی بوو
ئەفسووس زۆربەیان لە ئاوێنەدا خۆیان نەدیبوو
مردووەکانیش بوونە خۆڵەمێش
کە هێشتا یادەوەرییان بەسەر دڵەوە دەبریقایەوە
بەداخەوە هێشتاکە زوو بوو بۆ مردن
تۆ هەمیشە وەک ئەو جۆگەلانەی ڕەت دەبن
تا ئەمانەتی سەرپشتی خۆیان بەرنەوە بۆ دەریا
ئاورێکیشت نەسپاردە کەناری ئەو دڵەم
ئەوەتا وەک گوڵە پەمۆ وشکی کرد
وەک ئەو سپێدانەی ڕەت دەبن
تا شنە بەرنەوە بۆ ئەشکەوت و
هەوێردەکان چاویان ببێتەوە
سلاوێکت لە شلێرە سیس بووەکانی ڕۆحم نەکرد
ئەوێستا بەسەر کەڤرەوە ماتەمینترین ئاگرە
وەک ئەو تاوە بارانانەی دەبارن و
کەروێشکە دەخەنە بۆنی خاک
تا دڵی شکاوی مانگ بەرنەوە بۆ زەوی
تۆزێ لە ئاوێنەی مندا نەوەستای





## دوور و دێرینترین هاوار

تۆ ئەیتۆ ئەی شیرینترین ئەفسووس
کە نە سنوورێکت هەیە و نە نەبوونێ
تۆ ئەیتۆ ئەی ئەفسانەترین ئەفسون
کە نە سیماییێکت هەیە و نە هەبوونێ
زۆرم بیرکردۆتەوە کە دووری هەر دەبێ قەدەری تۆ بێ
بەعاشقی فەوتانیش هەمیشە و تا ئەبەد قەدەری من
لە میانی تەنیایی و تەنهامان هەرێمێ هەیە لە حەسرەت
جوانترین حیکمەتێ کە دەتوانم بەتۆی بڵێم و
هەمیشە دووبارەی دەکەمەوە
ئەوەیە من لە هەر دیدارێکتا گێلاسی خەمێکی ترم دەڕسکێ
گەڵای سەبرێکی ترم دەوەرێ
کۆمەڵێ لەبیرچوونەوە هەن
جوانترین بیرکردنەوەی مرۆڤن
ئاخر هەر بەو لەبیرچوونەوەیە ژیان خۆشە
تۆ هاوارێکی دوور و دێرینی
لە نادیارترین تەونی دەروونمەوە هەڵدەستێ
هەندێ جاران وا هەست دەکەم
کە ئەو هاوارانەی تۆ
لە ئەشکەوتێکەوە دێن و بەدوای فریادڕەسێ دەگەڕێن
هەندێ جاریش وای بۆ دەچم
لەسەر سەکۆی فریشتەکانەوە دێن و
بۆ سەمای پەنهانی خۆیان بانگم دەکەن
سەختترین ئازار ئەوەیە نازانم لە کام لاوە دێن
هەموو شتێ لە دەوروبەری تۆدا بۆنی ئەڤینی لێ دێ
ئەوێستاکەش شوێن پێی تۆم



لە ناو دڵما نەخشاندووە
لە ژێر ئاوی یەقیندا کوانوی ڕووناکین
دەرگای گومانم لەسەریا کڵۆم داوە
ئەوەیش کە دڵم پەی پێ دەبات سەرم پێی نازانێ
من و تۆ بەو عیشقەوە چەند لە یەک جیاین
چەند لە یەک دوورین
ئەڤینیش هەر ئەوەی حەقیقەتە
مەگەر مەرگ وەکو یەکمان لێ بکات
ئەشق تەنها بەچەشتەی ئازارەوە مانای هەیە
هەر ئەوەندەشی دەتوانێ دونیا بگۆڕێ
هەرگیز نامەوێ بەتۆ بگەم
چونکە ئەو کات هەموو جوانییەکان
هەموو ئارەزووەکان
دیدگا گەورەکان
خەونە ئاسمانییەکان
مەلە ڕەنگاوڕەنگەکانی لێکدانەوە
لە چەمکی خۆیان بەتاڵ دەبنەوە
تۆ هەر ئەوەندە دەتوانی لە سینەمدا حوکمڕانێتی بکەی هەتا دووری
هەموو شتە دوورەکان ئاواتخواستەی مرۆڤن
تۆ هەر ئەوەندە دەتوانی کوانوی جوانییەکانی دڵم بیت هەتا ونی
هەموو شتە ونەکان ئارەزوو ویستەی مرۆڤن
ئای چەند لە دووری تۆ ئەیتۆ میهرەبانترین دوژمنم
شێتانە چوومەتە پاڵ ئەو کێوانە
لەگەڵ خوادا پەیڤیوم
ئای چەند ونی تۆ ئەیتۆ خەنیمیترین دۆستم
مەستانە چوومەتە سەر کەنارەکان و

لەگەڵ شەپۆلان خەملێوم
لە خوادا توامەوە و بوونت نەما
لە شەپۆلانیش باڵم گرت بوونم نەما
تۆ ئەی منێکی دوور دوورتر لە سنووری خەیاڵ
من ئەی تۆییێکی نزیک، نزیکتر لە خورپەی مەحاڵ.



## ئێوارەی کۆترێ لە نووسینەوەی فڕیندا

ئیدی پەستی دەشتە سووتاوەکان
وەک لەشکری وەهم گەیشتن
لە دەروازەی ئەفسانەیی گەراجی کۆتردا
کەون گۆڕا غەڵبە غەڵبێکی ئەجیب
کەوتە هەناوی زەمان و گەردوون پڕ بوو لە کۆتر
هێندێکیان هەر لە پەنجەرەی پەستەکانەوە
بەرەڵڵا دەبوون و ئاسمانی شینیان شەق دەکرد
هێندێکیان لاباڵێکیان لە دەرەوەی قەفەز بوو
لاباڵێکیشیان لە هەوڵی ڕەهایی
هێندێکیان هەر لەبەر سێبەری تایەکان سەردەبڕان
دەخرانە سەر دەمی ئاگر
قیامەتێک بوو لە تراژیدیا
دۆڵێک بوو لە ئاهەنگی خەمباری
سەماییێک بوو لە مەرگ
منیش چوومەوە ناو قودداسە خەمگینەکانی خۆمەوە
ئاخر فڕین لە سامالی شین و لە ناو هەڵمی هەورەکاندا
خەونێکە لە ڕەهایی کەی ئێوە ڕەهاییتان دیوە؟
فڕین بەسەر دەریاکان و قەڵا زۆر دوور و بەرزەکان
چیمەنێکە لە دڵنیایی کەی ئێوە دڵنیاییتان دیوە؟
ئەوە بوو باران باری و غەرقی تەنهاییێکی کوشندە بووم
کۆشکی ڕامانگیرم ڕووخا
ئەوە لەو کاتەدا بوو کە پاییز هەموو دەرگاکانی ئاوەڵا کردبوو
ڕەشەبا وەک مۆرانە درەختی دەڕنینەوە
گەڵاکانیش مەمکی خۆیان لەبەر باران دەشووشتەوە و لە ناو
یەکتری دەگریان

هەرمێکانیش دەچوونە ماڵی با بۆ داخوازیی مانگ تاقانە
کچی باران
پۆرەکانیش بۆ دواجار ماڵاواییبیان دەکرد و نامەیێکیشیان بۆ
من نووسی؛
تۆ حەکیمی سەر لیسی دڵی ئێمە بووی بۆ هێندە زوو
بەجێت هێشتین
هێلینمان بۆ لە تیشکی مانگ چێ کردبووی
پووشمان لە چیا هێنا بوو، ئاو و دانیش لە سەمەرقەند
منیش تەنیا
بەدیار مشتێ پووش و باوەشێ یادگاری کە هەموویان وەکو
لالە دەبریقانەوە
بیرم لەو ئاسمانانە دەکردەوە کە منی سپییان لە ناو شینی
زیوینیاندا دەشووشتەوە
چەند بەختەوەر بووم و چاوانی خۆم زیوڕێژ دەکرد
بیرم لەو بێچووە جوانانەی خۆم دەکردەوە بۆ کوێ چوون و
چییان لێ هات؟
چەندەها شەوی سارد بەدیاریانەوە ڕۆژم کردۆتەوە
بیرم لەو شنە بایانە دەکردەوە پەڕ و باڵیان دەکردمەوە و
ڕایاندەدامە سنوورە دوورەکان
ئەو سنوورە دوورانەی دیارن و دیار نین
کە دەیانگەینێ ون دەبن
کە تێدەپەڕین بەدیار دەکەونەوە
ئەوە بوو باران باری هەموو برینەکانم کولانەوە دەفتەرە جوانەکانی فڕینم
دەکردەوە
فڕینێ لە ژێر باران
فڕینێ لەبەر سامال



فڕینێ لەسەر بەفر
فڕینێ لە ژێر گوللە
فڕینێ بەسەر مناڵێکەوە بۆ تەقڵە
فڕینێ لە ناو سەبەتەی شامینۆک فرۆش
فڕینێ لە دوای دەربازبوون لە گەراجی کۆتر
دوا فڕینیش لە ناو قەفەزی کچە بچکۆلانەکەی پاشا
درەختەکانیش بەڕووتی باوەشیان بۆ دەکردمەوە
کراسە تەنکەکانی خۆیان بەئەمانەت لە لای با دانابوو
باش بێ پەروا هەر لەبەر خاتری جوانییەکان
دەستی بەسەفەرە درێژەکانی خۆی دەکردەوە
هەر کراسێکی دەدا بەمەلێک و ناونیشانی درەختەکەشی
بۆ دەنووسی
هەر سوخمەیێکی دەدا بەعاشقێ و باسی ڕەنگی پرچیشی بۆ دەکرد
هەر ستیانێکیشی دەدا بەڕووبارێک و تەمەنیشی بۆ دەنووسی
ئەوە بوو باران باری منیش غەرقی تەنهایی بووم
ئای چەند تەنها بووم تەنهاتر لە باخچە بێ کۆترەکان
منیش چوومەوە ناو قوودداسە خەمگینەکانی خۆمەوە





# مەرگی بخور

ئەم کۆمەڵە شیعرەی بەردەستتان زادەی چرکەساتێکی زۆر کورتە، ئەڤین و هەوەسێکی تەژی کەفوکوڵی تەسەووفە بەجۆرێ هەڵڕژاوە کە هەرگیز ناتوانم باس لە چۆنیەتی داگیرسانەوەیان بکەم، هێندە سادە لە ڕۆحم ترازاون کە خۆشم نازانم بۆ ئەوەندە ئەوداڵیانم.

*بۆ: م. زامدار پێشکەشە*

(١)

گریانێ بوو گریانێ دوور
گاڤی گلەیی و گازاندە و گەرموگوڕی ئازارێ بوو
یائی یاس و یەک و یار و یاوەرێ بوو
رائی ڕەو و ڕازی ڕەوەزێ بوو
نونی نەوا و نەست و نان و نەناسێ بوو
بائی بەور و بۆن و بەرامەی بابان بوو
واوی ویزە و وێرانی وارێ بوو
گریانێ بوو گریانێ دوور
گریانی کۆتاهاتنی باڵا چنارینی بخور

(٢)

کە بۆن و بەرامەت دەڕژێ
ئەی گوڵ تازە بۆت کۆناکرێتەوە
کە ساماڵ دونیا لە زیو وەردەدا
ئەی ئاسمان تازە بۆ لات نایەتەوە
کە وەک پیاوێکی نوورانی
دەچیەوە خەونی بەهاران
تازە ناتوانی ڕزگار بی لەم ئافەتە
کە تێکەڵی جلوەی ئەبەدی خوا دەبی
تازە نابیەوە مرۆڤەکەی جاری جاران



(٣)

دەنگێ لە ئاسمان هەڵوەری
ئەم کەونە سپی هەڵگەڕا
دەشت و دەر پڕبوون لە ئاو
چیا لە ڕەنگان نقوم بوو
ڕەز هەموو بوونە مەیخانە
چاو پڕ بوو لە حۆری و پەری
پیر هەموو جحێڵ بوونەوە
شەو نەما بوو بەچل چرا
هەموو پێکەوە تێکەڵ بووین
لە سیما و لە نەخشی خودا

(٤)

تۆ ئەی پیر پیری ناو بەفر و تەمتومان
پێی تۆ لەسەر لێوی گۆڕە
یای تۆ کفنێکی سپییە
ڕای تۆ مەرگی ئەبەدیە
ئەی پیر وەرە جامێ هەڵقوڕێنە
مەستی بەهەشتی ئەزەلییە
گوناهت دەکا بەپەپوولە و
بۆ یەکجاری دارستانی ڕۆحت چۆڵ دەکەن
دەبی بەهاودەمی جوانی
ئەی پیر تۆ ئەی ئەزەل و جاویدانی





(٥)

لە کوێ هاتبوو ئەو شەوقە
گەدابووم کردمیە شالیر
ڕەندی مەیخانە و ساقی بووم
ئێستا بوازیێکم پیر
دێ بووم و منی کردە شار
شار بووم و کردمیە وڵات
وڵات بووم بووم بەکیشوەر
کیشوەر بووم کردمیە دونیا
دونیا بووم کردمی بەکەون
کەون بووم کردمیە سەدا
ئێستا حوکمی گەردون دەکەم
لە کوێ هاتبوو ئەو شەوقە
عاقیبەت منی کردە خوا

(٦)

کچێک لە دوورترین شوێنی دونیا
لە سێبەری تاوێرە بەردێ
بەدیار ڕەوە پۆڕێکی سەرما
بەتەک ڕووبارێکی خەمگین
نزیک درەختێکی ڕووتەڵە
لە ناو کۆشێ گەڵای ڕژاو
بەسەر شەپۆلێ لە حەسرەت
بەمشتێ فرمێسکی ئاقیقی
بەجلێکی ڕەش و دڵێکی سپی
بەخەونی گەڕانەوەی عاشق
بەجیازێکی سادە





کە بریتییە لە ئاوێنەیێکی بەرباخەڵ و
شووشەیێ عەتر
وەستاوە سەیری دوور دەکا
بەڵکو یەکێ... ئاخ بۆ یەکێ چەشنی زۆربا
یا شێتێ عاشق و شەیدا
یا تەمێ گەرم گەرم وەک شنەبا
دەستی بگرێ و سواری ئەسپە شێکەی خۆی بکا
بۆ تا ئەبەد لە کچێنی و مەراقی ئەو ڕزگاری کا

(٧)

مەستیم وەک عەشق وایە
یا ڕووی لە زینی شامە
یاخود ڕووی لە خودایە
خوا پارچێکە لە زین و
زین پارچێ لە خودایە
لە میانی من و زیندا
من شەڵاڵی مەحاڵم
توانەوەم لەودایە

(٨)

تەم بوو هات لە دوورەوە
وەک پیاوێکی نوورانی
ڕیشی لە زەوی دەخشا
کاتێ کە دونیای داگرت
مەمک پڕ شیربوونەوە
چرا هەموو داگیرسان
شەهید بەکراسی خوێنین
هەمووی زیندووبوونەوە

کاتێ کە تەم ڕەویەوە
خوا لە ناویا بەدیار کەوت
بەدەستی پڕ لە بازی
بەکەمەند و بەڕازی
ئێمەی بۆ خۆی بردەوە

(٩)

جارێک نەبوو پێکەوە ئەو پیر و من مورید بم
جارێک نەبوو پێکەوە ئەو لوتکە و من بنار بم
کاتێ کە ئەو دەبووە پیر
لە توانەوەم لە ئەودا هیچ وجودم نەدەما
کاتێ دەبووە موریدم
پیریم لەودا نەدەما
کاتێ کە بنار بووایە
لوتکەم غەرقی نوور دەبوو
کاتێکیش ئەو لوتکە بوو
بنار پڕ بخور دەبوو
مەدەدی پیری بوخارا
کاتێک کە دەتوێینەوە لە نێو یەک قەترە مەیدا
بۆ ئەو لوتکە و بنارە

(١٠)

من بەندەم و ئەو خودا
من خودام و ئەو بەندە
کێشەیێکی ئالۆزە
بریا بەبریاداران
ئەو هەر لێرانە بووایە
دەمێک من لە دڵیابام



دەمێک ئەو لە دڵ بووایە
دەمێک من بوومایە خوا
دەمێک ئەو خودا بووایە
ئێمە یەک چرا و تیشکین
جارێ ئەو فەیزی نوورە
جارێ من فەیزی نوورم
هێندە لەوم ڕوانیوە تا بینای هەڵمژیوم
ئێستا ئێمە یەک دەورەین
لە سووڕانەوەی کەونا
یەک ئەشق و یەک ڕوخسارین
یەک بوون و یەک پرسیارین

(١١)

ئەی نای
گەوهەری ڕۆح
دەزانی بۆ نەوات ئەوەندە غەریبە
چونکە هەموو دەنگی فیراق
لەگەڵ خاک و نیشتمانی هاوتەریبە

(١٢)

هێندە بەرز هەڵمەفڕن
جێگە نەویەکان خۆشترە
کە هەموو بچنە بەرزایی
ئەوە خاک دڵی توند دەبێ لە تەنهایی





(١٣)

خودایە من کە دەمبەوە بەخۆڵەمێش
چیم بەسەر نەمریی دایە
بۆ ئەو شەرابە شیرینە نەخۆمەوە
کە لە ناو گۆزەی ڕۆحتایە

(١٤)

هەزاران شەو سەیری تۆم کرد
هەندێ جار ئەستێرە بووی دادەڕژای
هەندێ جاریش
شووشە عەترێکی تابان بووی
بەڕووی منا دادەپژای

(١٥)

سەیرکە هەموویان گۆرانی دەچڕن
ژێر پێشیان جەستەی ئینسانە
قەدەر وایە
لە میانی مەرگ و ژیاندا
بۆ ئەبەد جەنگە بەرپایە

(١٦)

جوانی تۆ وەک شەفەقێکە
بەسەر بەهەشتەوە هەڵێ
کە من ڕێم بەرەو دۆزەخە
ئای لەو پارسەنگە سەختە



(١٧)

ئەو میحرابە جێی تۆ نییە
تۆ فریشتەی نێو مەیخانەی
بەقەترەیێ دەگەیتە خوا
کام ڕێگە زوو دەتبا بۆ لای
ئەو ڕاستەقینەیە بەخوا

(١٨)

ئای تان و پۆی ئا ئەم کەونە
کە تۆ نەبی
عەدەم هەمووانی قووت داوە
بەڵام کە هەی شەیتانێکی
ڕەنجی خودات بەبا داوە

(١٩)

چەند سەختە شەو
چەند دژوارە
هەموو ساتێکی من شەو بوو
چەند دوورە ڕێ
چەند تەنهایە
هەموو تەمەنم بەسەرچوو
نەگەیمە جێ

(٢٠)

تۆ چەند ونی من ئاشکرا
تۆ تاریکی و من چل چرا
کاممان ڕاستەقینەین برا؟

(٢١)

تۆ وەک بەفری
لە ناولەپم دەتوێیتەوە
منیش وەکو ئاڵەکۆکێ
لە بن تارای سپیت ژینم بەسەردەچێ

(٢٢)

برۆ وا باران دەبارێ
ئێ بەڵکو ڕۆحت تەڕ دەبێ
منیش تۆزێ دەحەسێمەوە

(٢٣)

وا ئەو پێکەش دەخۆمەوە
با تەمەنم هەر با بیبات
سپێدە هەرچ باد ئاباد

(٢٤)

گوڵێکە دوور
بۆی دەچم دادەخرێتەوە
جێی دەهێڵم
وەک شەوبۆ دەکرێتەوە

(٢٥)

ئەو چرایە مەکوژێنەوە
تۆ لە ناو ڕووناکی ئەوای
گۆزەی دڵی من مەشکێنە
خۆت تیا ورد و خاش دەبی



(٢٦)

ئەی با ئەی با
وەرە دوور دوور هەڵمگرە
لێرە ژەنگم هەڵێناوە
دەزانم لە دووریش دەڕزیم
قەیدی چییە
نییەتی مەرگم هێناوە

(٢٧)

ناکرێ لەو بایە جێت هێڵم
دەترسم پەرشی دونیات کا
یا ون ببی لەو کێوانە
کە تۆ پەرشی دونیا ببی
دەبێ مانای ئەزەل چ بی؟

(٢٨)

کە بەرەو ئاسمان هەڵدەچووی
زانیم مەسیحی خۆم هەیە
کە بەپەیژەکان دابەزی
زانیم تۆ بەرەو خاچ دەچی

(٢٩)

چەند حیکمەتی خۆم هەڵڕێژم
بیرم ئەوەندە تیژ دەبێ
چەند کاژی هزرم فڕێدەم
ئەوەندە ئاسۆم سوور دەبێ

(٣٠)

سەرەتا هەورێکی سپی بوو
لە سینەی سامالێکی زیویین
بایێ هات ڕایمالّی
چی نهێنی هەبوو لەبەریا دایمالّی
ئێستێکەش دلّۆپەی بارانی
لە شوێنێ هەلّناکا
ئەیەوێ پیریی خۆی جێ هێلّێ و
بچتەوە ئاسمانی جارانی

(٣١)

سەرەتا پەڕی نەرمی زمان
شەکر بوو ئەیشکان
هەنگوین بوو بەڕووتا ئەیپژان
زمان بوو گۆرانی و بالۆرەی ئەچڕی
ئەوێستاش زمانە
بەگیزانی قسەی ژەهراوی
کەمەران لەت ئەکا و گەردنان ئەدڕی

(٣٢)

سەرەتا دلّ هەوێنی خورپە و
هەلّگری خەمان بوو
لە میانی من و تۆ دلّ ئاوێنەی دلّ بوو
ئەوێستاش ئەو دلّە جاڕسی ژەهری بەردەبانە
بۆ تاوێ تروسکە نابینێ و هەر مەکۆی خەمانە



(٣٣)

سەرەتا زریکەی چەمان بوو
یا پشکۆی نێو گەرووی کەمان بوو
وەلێ ئێستا ژەهری دەبانە
پەنجەران لە سینەی ئاسکان وا ئەکا
چیایان لە تەمی لوتکە ئەوروژێنێ
دەرەنجام هاواران لە لێوی زۆر ناسک ئەسێنێ

(٣٤)

سەرەتا هەر دەست بوو سۆی سارێژ ئەکردن
هەر زەبری پەنجە بوو بەدکار پێی ئەمردن
سەرەتا هەر دەست بوو کە پرچی کیژانی
لوول ئەکرد
سەرەتا هەر دەست بوو
بۆ منالّی بێشکە درەختی نیایی
ئێستێکەش هەر دەستە
ئەچێتە بینەقاقای گەرمی چیایی
یا ئەکرێتە پردی کۆدێتا و ڕیایی

(٣٥)

سەرەتا هەر گەردن ڕووگەی شیعر و
مەزاری دلاّن بوو
هی خەناوکەی دیاری و ڕیسەگیای بۆندار بوو
یا ترێ خورابا لە گەردن دیار بوو
ئێستێکەش بۆ تیری شەمشێری زەمانە
گەردەنە کە بۆتە نیشانە





(٣٦)

سەرەتا شەپۆل بوو
پەرپە سەر کەناری ئەم هەرد و کێوانە
کەڤر بوو بروسکێ لەتی کرد
لە قژی چەمێکا داگیرسا
بوبێکە ژێی تەنبور
لە پەنجەی زۆربادا داییسا

(٣٧)

سەرەتا بریقەی ڕوومەت بوو
ڕووناهی ئەدایە ئەم کەونە
سەرەتا هێلانەی مراز بوو
مرازێ ئێستێکەش هەر خەونە
زەمانە نێچیری تەوێڵی دۆزیەوە و
خەرەندی هەڵکەنی

(٣٨)

سەرەتا چاو تەنها جوانی بوو ئەیبینی
هەر تەنها نێرگزی دامێنی ئاو ئەدا
سەرەتا چاو تەنها بۆ تولاز و شۆخان
ئەتروکا
وەلێ ئێستا ڕەشی ئەو چاوە
هەر ئەڵێی بۆ گریان خولقاوە
ئەوەتا شاعیریش بۆ میوانی پیری ئەخەنی

# پێڕست

## خاک و هەڵۆ


سرووتەکانی نووسین ..... 7
شەوان شیعر هێلانەیە ..... 13
لە لاپەڕەی عیشق و خەما ..... 14
پشوودان ..... 16
بەرزی ..... 17
سۆراخ ..... 18
وەرزێکی گران ..... 19
دڵێکی سووتاو ..... 20
خەرابات ..... 21
پەرژینە ئاخ ..... 22
پەڕیوە ..... 23
شاعیر ..... 24
لەگەڵ خۆمدا ..... 25
هەوارگە ..... 26
شوێنەوار ..... 27
چڵەپۆپە ..... 28
چرپەیەک ..... 30
ئەوانەی لە ناخەوەن ..... 31
ساتەکانی ئەوین ..... 32
هەڵۆ ..... 33
شەوسوار ..... 35
ئاسۆ باران ..... 38
خاک ..... 41
شیوەن ..... 42
زویربوون ..... 43
خەونی بەهاران ..... 44
حەزێکی ڕۆمانسی ..... 45
شەونزا ..... 46




## تەمە سپییەکانی ڕۆح


میدۆزا ..... 49
مێوانداری ..... 50
مەرگی چوارگۆشەیی ..... 52
ئاستانەی نامۆ بوون ..... 53
سەرکێش ..... 55
زۆربا ..... 57
تەمە سپییەکانی ڕۆح ..... 60
هەرێمی حەوانەوە ..... 62
بڕیار ..... 63
کەپری خۆڵەمێش ..... 64
ئۆلیس ..... 65
«...» ..... 66
ڤالیۆم ..... 67
شەمشێر ..... 68
«...» ..... 69
جەنە ..... 70
ئاڵۆزی ..... 71
قرژاڵ ..... 72
ساتێ بۆ مەرگ ..... 73
سزا ..... 74
ئەبەدی ..... 75
ئەڵقەی بۆش ..... 76
سێوی مەرگ ..... 77
گوڵی پێوانەیی ..... 79
دوا سەفەر ..... 83
ستونەکانی با ..... 84


**وردە گەلا** - شیعری درامی


خان ..... 120
چل کەزی ..... 123
چاودێری ..... 126

دوا گۆرانی ..... 129
وردەگەڵا ..... 156


## پیانۆی ڕۆژهەڵات


کتێبی نۆستالگیا ..... 174
کەڵەکێوی ..... 175
ئەسپەکان ..... 177
ئاسکەکانی نێو شووشە ..... 179
نۆستالگیا ..... 181
لوتکە ..... 183
پیری بخور ..... 184
هەڵوەرین ..... 186
بەختەوەرەکانی سەر زەوی ..... 188
تەوقی وشە ..... 191
کتێبی با ..... 192
کۆمیدیای با ..... 193
هەڵوەشانەوەی با ..... 196
کتێبەکانی با ..... 200
پیانۆی ڕۆژهەڵات ..... 203
کۆچی شمشاڵ ..... 209
وەرزێک لە گوناھ، وەرزێک لە ئایدیا ..... 212
وەک کەنارییەکان هێمن وەک قەدەر ترسناک ..... 216
کتێبی جەنگ ..... 220
فەیلەسوفەکانی شەڕ ..... 221
باخچە هەڵبزڕکاوەکانی مید ..... 223
ڕاهیبەکانی وەهم ..... 227
شیکار ..... 231
کۆست ..... 234
سیپارەیەک لە ئیستەتیک ..... 235
خۆڵەمێش ..... 237
دوای سەعاتی بیست و پێنج ..... 239
یادستان ..... 244





ئەڵقە ..... 246
کتێبی ڕۆح ..... 247
باخی فەنا ..... 248
بولبولەکانی فەرەنسا ..... 251
شکستە ڕۆحییەکانی ئەخاب ..... 254
ئاوێنەی سێو فرۆشان ..... 260
دیلبوون لە ئەفسووس ..... 264
ژوورەکانی تەهارەت ..... 266
چەکنووسەکانی خەڵوەت ..... 271
شەقامێ لە ئاسمان ..... 274
کتێبی دیدگا ..... 277
بەردی مەراز ..... 278
ئۆرڤیوس ..... 282
پەیتونی شەرابی ..... 285
مەچکۆ ئەی تایتانیکی شارەکەم ..... 287
ئەی دژوارترین دۆست ..... 290
حەڵاڵتر لە شیری دایک ..... 293
تا ئەبەد خاچ ..... 295


## درەختی حیکمەت


کتێبە جوانەکانی قەدەر ..... 301
وەسیەتخامە ..... 303
شکستی گەوهەر ..... 305
ئەمیرە جوانەکان ..... 306
شاعیر ..... 307
برۆنزیەکان ..... 309
کاسەیێک چەنگاڵ ..... 311
شکانی ئاو ..... 313
ژنێک لە گیا ..... 316
شمشێری ئاوین ..... 318
درەختی حیکمەت ..... 322
کەمال المُلك ..... 325






باخچەی یەقین 329
نێرڤانا 331
تەوتەم 333
پرۆژەیێک بۆ شکست پرۆژەیێک بۆ عەدەم 334
درەختی درووەد 338
لەوانم چاوپێکەوتن 341
شەممەکان 344
پیاوەکانی جەنگەڵ 347
سوندسیەکان 352
فریاکەوتنێ ئەی دۆست 354

**دۆستێ هەمیشە چاوەڕوانمانە**

گەمەی دژەکان 359
ئای دڵەکەم چەند خەمباری 361
ئەو ئاگرە داگیرسێنەوە مێرێ 364
کتێبی خوڵقان 366
مارکۆپۆلۆ 368
قاپێ مەحاڵ 371
غەرق بوون 374
ئاوێنە 375
بوراق 378
یادستان 380
تاووس 382
مەیلێکی درەنگ وەخت 385
دۆستێ هەمیشە چاوەڕوانمانە 387
ئەفسووس دڵەکەم 389
دوور و دێرینترین هاوار 391
ئێوارەی کۆترێ لە نووسینەوەی فریندا 394
مەرگی بخور 397